إنْ فاتكم أنْ تروه بالعيون فَما
يفوُتكم وصفه هذى شمائلهْ
مُكمَّل الذاتِ في خلْق وفي خُلُقٍ
وفي صفاتٍ فلا تُحصى فضائله

ﷺ

# ڕووخسارو ڕەوشتە بەرزەکانی پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ)

کۆکردنەوەو ئامادەکردنی: حەمزە بەرزنجی

غَداً نَلَقى الأحِبَّة          مُحمَّداً ﴿ﷺ﴾ وَصَحبَه

---

**ناوی کتێب: ڕووخسار و ڕەوشتە بەرزەکانی پێغەمبەری خۆشەویست ﴿ﷺ﴾**

**نووسەر: حەمزە بەرزنجی.**

**تیراژ: ١٠٠٠ دانە.**

**چاپ: سێیەم_ ساڵی ١٤٢٧ کۆچی-٢٠٠٦ زایینی**

**ژمارەی سپاردن: (٤٧٦) ساڵی ١٤١٣ کۆچی ــ ٢٠٠٢ زایینی.**

بسم الله الرحمن الرحيم

*الحمد لله، والصلاة والسلام على رسول الله ، وعلى آله وصحبه ومن والآه.. وبعد .*

**بەدرێـژایی مێـژوو هـیچ دەسـتەو تاقمێـك نـەبووە كـەبێ پێشـەواو سـەركردە بـوو بێ، بـەجۆرێك شـوێن كـەوتوانی هـەوڵیان داوە كـە بـەجێ پێیـەكانی ئـەودا هـەنگاو بنێن و لەگەڵ حەزو بیر كردنەوەی ئەودا ئاوێتە بن .**

**موسـڵمانانیش تاكەپێشـەوایان ئـەو پێغەمبـەرە بەڕێزەیـە ﴿ﷺ﴾ كەسـەرداری كوڕانی ئادەمە(U)ونمونەی ڕەوشت بەرزی و جوامێری و خواناسیو پیاوەتی و ئازایەتی و هەموو ئاكارە بەرزەكانی ترە .هەركاتێك موسڵمانان بەجوانی دەستیان گرتبـێ بـە ڕێبازەكەیـەوەو بەشـوێن هـەنگاوەكانی كـەوتبن" سـەركەوتوو سـەرفرازو عیزەت مەندبوون و قورسایی خۆیان سەلماندووە، لەبەرئەمەیە دەبینین كۆمەڵانی صـەحابە (ڕەزای خـوای گـەورەیان لێ بێـت) یەكـەم وەچـەبوون كەلـە هـەموو كـەس زیـاتر ڕۆشـن بووبونـەوە بەتیشـكی زێڕینـی نبـوەت و زۆربـەی ڕەوشـتەكانیان وەك ئاوێنـە تیـادا دەدرەوشـایەوەو هـەوڵیان دەدا زیـاترو زیـاتر خۆیـان بشـوبهێننە پێغەمبەرە سەركردە ڕابەرەكەیان﴿ﷺ﴾،بەجۆرێ وەكو مەحوی شاعیر دەفەرموێ:**

**ئەوەندە بە عەكسی نوری نبوەت مونعەكیس بوبوون**

**غەریبی تازە هاتوو ئەیوت ئەم پێغەمبەرسـتانە**

**بەڵێ .. ئەوان لەو چاوگە بێ خڵتەوە خۆیـان تێـر ئـاو دەكـرد، لەقسـەو گوفتـار و ئاكـارو ڕەفتاریانـدا وەك ئـەویان دەكـرد بۆیـە وەك سـەید قگـب (رەحمـەتی خـوای گـەورەی لێ بێـت) دەفـەرموێ: بووبوونـە وەچـەیەكی قورئـانی ناوازە(جیـل قرێنـی فرید).كەبەرهەمەكەشـی ڕەزامەنـدی خـوای پـەروەردگاریان بـە دەسـت هێنـا ،پاشـانیش لـەم دنیاشـدا لـە ماوەیـەكی زۆر كـەم دا بـە هـۆی بانگـەوازی گوفتـارو كـردارو ئاكارە جوانـەكانیان گرۆیـەكی زۆریـان لەبەندایـەتی كردنـی غـەیری خـواوە گەڕانـدەوە سەرشـاڕێی ئیسـلام و بەندایـەتیخوای بەندەكان.وەلەسـەر دەسـتیان زۆرێك لەو وڵاتانە فەتح بوو كە پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ مژدەی فـەتح بـوونی دابـوو بەڵام بەچاوی خۆی نەیبینی .**

ئـەمڕۆش بـە هـۆی دوور کەوتنـەوەمان لـە ڕەوشـتە جـوان ئاکـارە بـەرزەکانی ئـەو پێغەمبـەرە خۆشەویسـتە، دەبیـنین کۆمەڵگاکـەمان پـڕ بـووە لـە دیـاردەی سـەیرو سـەمەرەو سـیمای موسـڵمانێتیو شـوێنکەوتویەتی پێغەمبـەرمان﴿ﷺ﴾ پێـوە نەماوەو بگرە زۆر جار ئەو دیاردە نوێیەش پەیدا بووە کە دەبینرێت سوکایەتی بەرامبەر خودی ئەو کەسایەتیە بەرزو بە حورمەتە دەکرێت. ئێمەش مەگەر تـەنها لـە مـانگی (ربیـع الأول) دا بـیری پێغەمبـەری خـوا﴿ﷺ﴾ و ژیاننامـەو ڕەوشـتەکانیمان بکەوێتـەوە. زۆر موسـڵمانیش هـەن خۆیـان بـە شـاگردو قوتـابی پێغەمبـەر﴿ﷺ﴾ دەزانـن بـەڵام نـاوی پێـنج پشـتی نـازانن، چ جـای ژییاننامـەو ڕەوشـتەکانی. واش دەزانـن خۆشەویسـتی دەربـڕین بریتیـیە لـە گـۆرانی ووتـن و شیرینی بەخشینەوە لە یادی لە دایك بوونیداو بەس....

خوێنـەری خۆشەویسـت .. ئـەم بەرهەمـەی بەردەسـتت .پوختـەی سـیفەتی ڕووخسـارو دیمـەن و ڕواڵـەت و لاشـەی پـیرۆزی پێغەمبـەرە ڕابەرەکەمانـە ﴿ﷺ﴾ کـەزۆرێکمان لێـی بـێ ئاگـاین ،پاشـانیش مشـتێکە لەخـەرواری ڕەوشـت و ئاکـارو ڕەفتـارە بـۆن خـۆش و ڕەونەقدارەکانی کەدۆسـت و دوژمنـی شـایەتی بەهـەقی بـۆ دەدەن .

کەتیایـدا هـەوڵم داوە بەشێوەی (مـەتن)پوختی بکـەم بـۆ زیـاتر ئاسـان کـاری و تێگەیشـتن و بـەپێی توانـاش تـەخریجی فـەرموودەکانم هێنـاوەو ووشـە قورسەکانیشم زیاتر شی کردۆتەوە بەپێی ڕاڤەی زانایـان و لـەنێوان دوو کەوانـەدا بەم شێوەیە [ ] دامناوە تابزانرێت کەئەمە تەرجەمەی دەقی فەرموودەکە نیە بەڵکو زیادە ڕوون کردنەوەیەکە .

لـەخوای پـەروەردگار داواکـارم یارمـەتیمان بـدات خۆمـان بـەو ڕەوشـتانەی پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ بڕازێنینەوە تابەختـەوەرو عیـزەت مەنـدی دونیـاو ڕووسـپی ڕۆژی قیامەت بین و شیاوی ئەوەبین لە ڕۆژی دواییدا بەدیداری شادبین.

حەمزە بەرزنجی

ربيع الأول / ١٤٢٢ کۆچی

# لەدایك بوونی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾

١-خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ لَقد مَنَّ الله على المؤمنين إذ بعث فيهم رَسولاً مِن أنفسهم يَتلو عَلَيهم آياتِه وَيزكيهم ويُعَلّمُهُمُ الكِتابَ والحِكمةَ وإنْ كانوا مِن قَبلُ لَفي ضَلالٍ مُبين ﴾ آل عمران/ ١٦٤ .

واتە:خوای گەورە منەتی نا بەسەر ئیمانداراندا کە لە ڕەگەزی خۆیان پێغەمبەرو نێردراوێکی بۆناردن تا ئایەتەکانی خوایان بەسەردا بخوێنێتەوەو (فەرمانیان پیێ دەکات بە چاکەو بەرگریان لیێ دەکات لەخراپە) تاپاکیان بکاتەوە لەپیسی، وەقورئان و سوونەتیان فێر بکات .ئەگەرچی پێش هاتنی ئەو پێغەمبەرە ﴿ﷺ﴾ ئەوان لە گومڕاییەکی ئاشکرادا بون .

٢-وەخوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ قُل إنما أنا بشر مثلكم يُوحى إلى أنَّما إلهُكُم إلـه واحِد ﴾ الكهف. واتە: ئەی پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ پیێ یان بڵێ بیێ گومان من مرۆڤێکم وەك ئێوە بەڵام نیگام بۆ دێت لەلایەن خواوە، کەوا پەرستراوی ئێوە یەك پەرستراوی بە هەقە .

٣-وە پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ دەربارەی بەڕۆژوو بوونی ڕۆژی دووشەمە ؟ فەرمووی: **((ذاك يَومٌ ولدتُ فيه، وَفيه بُعِثتُ، وفيه أُنزِلَ عَلِيَّ (القُرآن))** رواه مسلم . وا تە : ئەوە ڕۆژێکە تیایدا لە دایك بووم و تیایدا کرامە نێردراو و پێغەمبەرو تیایدا قورئانم بۆ سەر دابەزێنرا .

٤ -پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ لە ڕۆژی دووشەممەی مانگی رەبیع الأولدا لە دایك بووە لە شاری مەککەی پیرۆزو لە ماڵێکدا کە ناسراوە بە (دارالمولد) واتە:خانەی لەدایك بوون، لە ساڵی ناسراو بە ساڵی (فیل) کە دەکاتە (٥٧١ زاینی)، لە دایك و باوکێکی ناسراو :باوکی ناوی عبدالله ی کوڕی عبدالمطلبە ودایکی ناوی ئامینەی کچی وەهبە، باپیری ناوی نا (محمد) ﴿ﷺ﴾. وەباوکی پێش لەدایك بوونی ئەم وەفاتی کرد .

# ناو و سیفەت و نەژادی

**١-خوای گەورە دەفەرموێت :** ﴿ محمد رسولُ الله ...﴾ الفتح

**واتە :محمد نێردراوی خوایە .**

**٢-پێغەمبەری خوا (ﷺ) سوپاس کراو بووە[١] لە ڕەچەڵەکی‌یەوە بەپاکی و بێ لەکەیی هاتووەو خوای گەورە هەڵی بژاردووە[٢] ناوە جوانەکانی زۆرە لەوانە : ( محمد – أحمد – الماحی – الحاشر –العاقب )[٣]**

---

(١)پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت (( **ألا تعجبونَ كيف يُصرفُ الله عنّي شتم قريش ولعنهم؟ يشتمون مُذمماً،ويلعنون مُذمماً ،و أنا محمد** )) رواه البخاري.

**واتە: ئایا سەرتان سووڕنامێنێ چۆن خوای گەورە جوێن و نەفرینی قورەیشم لێ دووردەخاتەوە؟ئەوان جوێن و نەفرەت بە کەسێك دەدەن بە خراپەکارو لۆمەکراو ناسرابێ، بەڵام من سوپاس کراوم .**

(٢)پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : **((إن الله اصطفي كنانة من ولد اسماعيل، واصطفي قريشاً من كنانة، واصطفي من قريش بنی هاشم. واصطفاني من بني هاشم))** رواه مسلم.

**واتە: خوای گەورە لەمناڵ و نەوەکانی ئیسماعیل دا(**عليه السلام**) (کەنانە)ی هەڵبژاردو لە نەوەکانی کەنانەش دا (قورەیش)ی هەڵبژاردو لەقورەیش دا (نەوەی هاشم )ی هەڵبژاردوو لەنەوەکانی هاشمیشدا منی هەڵبژاردو کردمیە پێغەمبەر (ﷺ)**

(٣)**عن جبير بن مطعم قال :قال رسول الله (ﷺ): ((إنَّ لي أسماء: أنا محمد، وأنا أحمد، وأنا الماحي الذي يمحو الله بي الكفر، وأنا الحاشر الذی يَحشُرُ الناس على قدمي، وأنا العاقب، والعاقب الذي ليس بعده نبي)).**البخاري ومسلم بزيادة والترمذي (٢٨٤٢)وهو حديث صحيح

**واتە: من چەند ناوێکم هەیە لەوانە :من محمدم [بەمانای ئەو کەسەی زۆر سوپاس دەکرێ لەسەر ڕەوشتە بەرزەکانی] و من أحمدم [بەمانای لە هەموو کەسێ زیاترو چاکتر سوپاسی خوای پەروەردگار دەکات] ومن (الماحی)م ئەو کەسەم کەخوای گەورە بە من کوفر ناهێڵێ و دەیسڕێتەوە، وە من (الحاشر)م کە خەڵکی لەڕۆژی دوایی دا بە هۆی هاتن و شەفاعەتی منەوە حەش ردەکرێن، وە من (العاقب)م ئەو کەسەم کە هیچ پێغەمبەرێکم لە دواوە نی‌یە.**

وه(**نبي الرحمة - نبي التوبة –المقفي – نبي الملاحم**)[٤] وه له تەوراتا ناوی به (**المتوكل**) هاتووه .[٥] وه خوای گەوره وەسفی کردووه به (**رؤوف**) و (**رحيم**) [٦]

---

(٤) له حوزەیفەوه فەرمویەتی :گەیشتم به پێغەمبەری خوا(ﷺ) له ڕێگایەکی شاری مەدینەدا وفەرمووی : ((**أنا محمد، وانا أحمد، وأنا نبي الرحمة، ونبي التوبة، وأنا المقفي، وأنا الحاشر، ونبي الملاحم**)) رواه الترمذي و حسن اسناده الالباني وصححه ابن حبان (٢٠٩٥) و رواه أحمد و ابن سعد .

واتە:من محمەدم و من أحمەدم و من پێغەمبەری بەزەیم [مەبەستی ئایەتی : ﴿ وماأرسلناك الارحمة للعالمين ﴾ الانعام /١١٧] وه من (نبی التوبة)م واته پێغەمبەری تەوبەم ومن (المقفی)م که دوا پێغەمبەرم و من (الحاشر)م که خەڵك بەهاتنی من حەشر دەکرێت له ڕۆژی قیامەتداو من (نبي الملاحم) پێغەمبەری جەنگم [لەبەر ئەوەی خەڵکی لەسەری خوێنی یەك دەڕێژن].

(٥) له عەطائی کوڕی یەسارەوه فەرموی: گەشتم به عبدالله ی کوری عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خوایان لێبێت) وتم :هەواڵم بدەرێ کە سیفەتی پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ چۆن بووه لەتەوراتدا .فەرموی: (**أجل والله إنه لموصوف في التوراة ببعض صفته في القران** ﴿ يا أيها النبي إنا أرسلناك شاهداً ومبشراً ونذيراً ﴾ **وحرزا للاميين أنت عبدى و رسولي. سميتك المتوكل ..**) احرجه أحمد وقد رواه البخاري في البيوع، أنظر تفسير ابن كثير ٣/٤٣٤ .

واته: بەڵێ سویچند به خوا ئەو له تەوراتدا وەسف کراوه بەهەندێ لەو وەسفانەی که له قورئاندا هاتووه: ئەی پێغەمبەر ئێمه تۆمان ناردوه به شاهێدی ومژدەدەری و ئاگادار کەرەوەیی، وەتۆ پارێزەری نەخوێندەوارانی .تۆ بەندەو نێردراوی منی .ناوم ناوی (المتوكل) پشت به خوا بەستو ...

(٦)خوای گەوره دەفەرموێت :﴿ لقد جاءكم رَسولٌ مِن أنفُسكُم عَزيزٌعليه ماَ عَنتُّم حَريصٌ عَلَيكُم بالمؤمنين رؤوفُ رَحيم ﴾ التوبة /١٢٨ .

واته: خوای گەوره نێردراوێکی بۆ ناردن لەخۆتان که ئەوشتەی باری شانی ئێوەی پێ قورس دەبێ ئەو بێ تاقەت دەکات وەسوره لەسەر هیدایەت دان و سود پێ گەیاندنتان و بەرامبەر به ئیماندارانیش بەسۆز ومیهرەبانه.

**هەروەها پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ڕێی داوە كە خەڵكی نەوەكانیان وەك ئەو ناو بنێن بەڵام نەهی كردوە كە خەڵك بەكونیەی ئەو كونیە بكرێ** (٧)

## له فەزڵەكانی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾

**پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾مژدەدەرو ئاگاداركەرەوەو ترسێنەرو چرایەكی ڕۆشنە**(٨)

---

(٧)پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ دەفەرموێت **(( تسموا بإسمي، ولا تكتنوا بكنيتي ،فإنما أنا قاسم. أقسم بينكم))** رواه مسلم .

**واتە :ناوی نەوەكانتان بێنن بەناوی من ،بەڵام بە (كونیە)ی من كە[ أبا القاسم] ە (كونیە) یان مەكەن چونكە من بەش كەر (قاسم) م خێرو چاكە بەش دەكەم لە نێوانتاندا .**

**ناوی تەواویپێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ بەم جۆرەیە[محمدی كوڕی عبدالله كوڕی عبدالمطلب كوڕی هاشم كوڕی عبد مناف كوڕی قصي كوڕی كلاب كوڕی مرة كوڕی كعب كوڕی لؤی كوڕی غالب كوڕی فهر كوڕی مالك كوڕی النضر كوڕی كنانة كوڕی خُزيمة كوڕی مدركة كوڕی إلياس كوڕی مُضر كوڕی نذار كوڕی مەعد كوڕی عدنان] كە تا ئێرە بە ڕاستی وصەحیحی هاتووە و لەسەرو ئەمیشەوە ئیختیلاف تێدایە . بەڵام گومانی تێدا نیيە كە عەدنان لە نەوەو كوڕانی(اسماعیل)پێغەمبەرە(عليە الصلاة و السلام)**.بروانە الرحيق المختوم لا٤٧ و مختصر سيرة الرسول – محمد بن عبدالوهاب.

(٨) **خوای گەورە دەفەرموێت** ﴿ يا أيها النيُّ إنا أرسلناكَ شاهِداً ومُبَشّراً وَ نَذيرا، وَداعياً إلى الله بإذنهِ وَ سِراجاً مُنيراً، وَبَشّرِ المؤمنينَ بأنَّ لَهم مِنَ الله فضلا كَبيراً ﴾ الأحزاب.

**واتە: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە تۆمان ڕەوانە كردوە كە شایەتیدەر بیت لەسەر تەنهایی خوا. وە لە قیامەتیشدا لەسەر ئومەتەكان ببیتە شایەت، وە مژدە دەرو ئاگاداركەرەوەو ترسێنەر بیت .وەمژدەش بدە بەئیماندارانی كە لەلایەن خواوە فەزڵێكی گەورەیان بۆ هەیە .**

**پێغەمبەری خواو کۆتای پێغەمبەرانە[٩] زۆر ترین شوێن کەوتەی هەیە لە ڕۆژی دوایی‌داو یەکەم کەسە کە لە ڕۆژی دوایی‌دا دەرگای بەهەشت دەدات[١٠] یەکەم تکا کارە لە بەهەشتدا[١١] چاوی دەنوست بەڵام دڵی نەدەنوست [١٢] سەرداری کوڕانی ئادەمەو یەکەم کەسە زەوی بۆ لەت دەبیّ و زیندوو دەبێتەوەو یەکەم شەفاعەت کارە لە مەحشەردا [١٣]**

---

(٩)**خوای گەورە دەفەرموێت :**﴿ ماكانَ محمدٌ أبا أحـدٍ مِـن رِجـالِكُم وَلكـنْ رَسـولَ اللهِ وخـاتم النبيين وكان الله بكل شيء عليماً﴾ الأحزاب.

**واتـە :محمد باوکی هیچ یەکێك لە پیاوانی ئێوە نی‌یە، بەڵکو پێغەمبەری خواو کۆتای‌پێغەمبەرانەو خوای گەورەش زانایە بەسەر هەموو شتەکاندا .**

(١٠) **پێغەمبەر** ﴿ﷺ﴾ **دەفەرموێت: ((أنا أكثر الأنبياء تبعاً يوم القيامة ،وأنا أول من يقرع باب الجنة))** رواه مسلم

**واتە: من لەڕۆژی دوایی‌دا لە هەمووپێغەمبەران زیاتر شوێن کەوتەم هەیەو یەکەم کەسم کە لەدەرگای بەهەشت دەدەم .**

(١١) **وە دەفەرموێت** ﴿ﷺ﴾: **((أنا أول شافع في الجنة، لم يُصدَّق نبي من الأنبياء ما صُدِّقت، وإنّ نبياً من الأنبياء ما صدّقه من أُمّته إلا رَجل واحد))** رواه مسلم .

**واتە: من یەکەم کەسی شەفاعەت کارم لەبەهەشت دا، هیچ پێغەمبەرێك بە ئەندازەی من بەڕاست دانەنراوەو شوێن کەوتەی نی‌یەو پێغەمبەرێك لە پێغەمبەران هەیە جگە لە یەك پیاو لە گەلەکەیدا کەس بەڕاستی نەزانیوەو شوێنی نەکەوتووە.**

(١٢) **ئەنەسی کوڕی مالك لە فەرموودەکەی شەوڕەوی (الاسراء) دا تیایدا هاتووە کە فەرموویەتی : (والنبي** ﴿ﷺ﴾ **نائمة عيناه، ولا ينام قلبه)** رواه البخاري. **واتە: پێغەمبەر**﴿ﷺ﴾ **چاوەکانی خەوتبوون و بەڵام دڵی هەرگیز نەدەخەوت و بەخەبەر بوو .**

(١٣) **وە دەفەرموێت** ﴿ﷺ﴾: **((أنا سيد ولد آدم يوم القيامة، وأول من تنشَقُّ عنه الأرض، و أول شافع ومشَفَّع ))** رواه مسلم

**واتە: من سەرداری نەوەکانی ئادەمم (U)لەڕۆژی دوایی‌دا، وەیەکەم کەسم کەزەویم بۆ لەت دەبێت و لەگۆڕ دێمە دەرو یەکەم شەفاعەت کارو یەکەم شەفاعەت وەرگیراوم .**

بەسەر پێغەمبەرانی تردا فەزڵ دراوە بە شەش خاسیەت و تایبەتمەندی گرنگ (١٤) وەلەچاکترین سەدەو چاخدا نێردراوە(١٥)زۆربەی نزاو پاڕانەوەکانی گیرابوون (١٦)

---

(١٤) دەفەرموێت ﷺ: **((فضلت على الأنبياء بست: أُعطيت جوامع الكلم، و نصرت بالرعب، و أحلّت لي الغنائم، وجعلت لي الأرض مسجداً وطهوراً، وأرسلتُ إلى الخلق كآفّة، وخُتِم بي النبيون))** رواه مسلم

واتە: فەزڵم دراوە بەسەر پێغەمبەراندا بە شەش تایبەت مەندی: ووتەی گشت گیری کورتم پێدراوە کە وتەیەکی کەمە و مانایەکی زۆری هەیە [ئەگونجێت قورئان بێت یان فەرموودەکانی خۆی بێت والله أعلم] وە سەرخراوم بەسەر دوژمنانم دا بە ترس لە[لە ریوایەنێکی تردا: مانگە ڕێیەك لێم دەترسن] وە غەنیمەتم بۆ حەلاڵ کراوە ، وە هەموو زەویم بۆ کراوە بە شوێن کوڕنوشگا و پاکێتی [بۆ نوێژ کردن و تەیەمموم] وە نێردراوم بۆگشت دروست کراوان، وە بە هاتنی من پێغەمبەرایەتی کۆتایی پێ هێنرا .

(١٥ ) دەفەرموێت ﷺ: **((بُعثتُ من خير قرون بني آدمَ قرناً فقرناً، حتى كنت من القرن الذي كنت فيه))** أخرجه البخاري .

واتە:من نێردراوم لەچاکترین چاخ و سەدەی نەوەکانی ئادەمدا چاخ لە دوای چاخ هەتا لەم چاخەدا بووم کە تیایدا ڕەوانە کرام .

(١٦) دەفەرموێت ﷺ: **((سألت ربي ثلاثاً، فأعطاني ثنتين، منعني واحدة: سألت ربي أن لا يهلك أمتي بالسنة فأعطانيها، وسألته أن لا يهلك أمتى بالغرق فأعطانيها، وسألته أن لا يجعل بأسهم بينهم فمنعنيها))** رواه مسلم. و في رواية: **((فسألته أن لا يسلط عليهم عدواً من غيرهم فأعطانيها))**. رواه الترمذي والنسائي وصحح الألباني سنده .

واتە: داوای سێ شتم لەخوای گەورە کرد، دووانیانی پێ بەخشیم و یەکێکیانی لێ گرتمەوە: داوام لەپەروەردگارم کرد کە گەلەکەم بە برسێتی گشتی لە ناو نەبات پێی بەخشیم، وەداوام لێ کرد کەگەلەکەم بەنقوم بوون وخنکان لە ئاودا لەناو نەبات پێی بەخشیم، وەپاڕامەوە لێی کە گرفت و نارەحەتیودووبەرەکی لە ناو گەلەکەم دا نەبێت و یەکتری لە ناو نەبەن، ئەمەیانی لێ گرتمەوە .

لەریوایەتێکی تردا: وە داوام لێکرد کە دوژمنێکی تر لەغەیری خۆیان زاڵ نەکات بەسەریاندا پێی بەخشیم و لێی وەرگرتم .

وە تەواوكـــەری كـــاری پێغەمبەرایەتیـــە[١٧] وە بانگەوازەكـــەی ئیـــبراهیم پێغەمبەر(ﷺ)و مژدەكەی عیسی پێغەمبەر(ﷺ)و خەونەكەی دایكێتی[١٨]

---

(١٧) دەفەرموێت ﴿ﷺ﴾: **((إن مثلي و مثل الأنبياء قبلي، كمثل رجل بنى بنياناً فأحسنه وأجمله، إلا موضع لَبِنَة من زاوية من زوا ياه. فجعل الناس يطوفون به ويعجبون له، ويقولون: هلا وضعت هذه اللبنة ؟ قال: فانا اللبنة، وأنا خاتم النبيين))** أخرجه البخارى ومسلم

واتە: نموونەی من و پێغەمبەرانی پێش خۆم وەكو نمونەی كابرایەك وایە كە بینایەكی بە چاكیو جوانی دروست كردبێت، جگە لەوەی یەك خشتی لە گۆشەیەك لە گۆشەكانیدا هێشتبێتەوە و داینەنابێ، وە خەڵكی لەم بینایەدا بسوورێنەوەو پێی سەرسام بن و بڵێن: خۆزگە ئەو خشتەش دادەنرا بۆی؟ فەرموی: منیش وەك ئەو خشتە وام ومن كۆتایی پێغەمبەرانم.

(١٨) وە فەرمویەتی﴿ﷺ﴾: **((إني عند الله مكتوب خاتم النبيين، وإن آدم لمنجدل في طينته، وسأخبركم بأول أمري: دعوة إبراهيم، وبشارة عيسى، و رؤيا أمي التي رأت حين وضعتني، وقد خرج لها نور أضاءت لها منه قصور الشام))** صححه الحاكم و وافقه الذهبي و صححه الألباني في المشكاة .

واتە: من لە كاتێكدا لە لای خوای گەورە بە كۆتای پێغەمبەران نوسرا بووم كە هێشتا ئادەم (ﷺ) لەناو قورەكەیدا بوو دروست نەكرا بوو، وە هەواڵتان دەدەمێ بە یەكەم باسی خۆم كە من چیم: من پاڕانەوەكەی ئیبراهیم پێغەمبەرم(ﷺ)[كە فەرموی:﴿ وابعث فيم رسولاً منهم يتلو عليهم آياتك ويزكيهم ويعلمهم الكتاب والحكمة ...﴾ . ]

وەمژدەكەی عیسا پێغەمبەرم (علیه السلام) كە[فەرموی:﴿ وَمُبَشِّراً بِرَسولٍ يأتي مِن بَعدي اسمه أحمد ] . وە خەونەكەی دایكمم كە بینیبووی لەكاتێكدا منی بوو، نوورێكی لێوە دەرهات بەجۆرێك سەراپا كۆشكەكانی شام لێوەی ڕووناك بوویەوە .

# ديمەنی پێغەمبەری خۆشەویست ﴿ﷺ﴾ وەك ببینی

باڵای نەزۆر درێژو نەزۆر کورت بووەو ڕەنگیشی سپیەکی خوێن سارد نەبووەو زۆر ئەسمەر ڕەنگیش نەبووە. قژیشی لول نەبووە، سەرو ڕیشی بیست تاڵ موی سپی تێدا نەبووە[(١٩)]. ڕەنگی ڕووی گەشاوەو سپی کار بووە دەتوت بەزیو قاڵ دراوە. [(٢٠)]

---

(١٩) عن أنس بن مالك انه سمعه يقول: (**كان رسول الله ﴿ﷺ﴾ ليس بالطويل البائن، ولا بالقصير، ولا بالأبيض الامهَق، ولا بالآدمِ، ولا بالجَعد القَطِطِ ولا بالسَّبِط، بعثه الله تعالى على رأس أربعين سنة، فأقام بمكة عشر سنين، وبالمدينة عشر سنين، توفاه الله على رأس ستين سنة وليس في رأسه ولحيته عشرون شعرة بيضاء**) البخاري ومسلم ومالك والترمذي وقال:حديث حسن صحيح، والبغوي في ( شرح السنة ) ( ٣٦٣٥ ) ٠ وهو صحيح ٠

واتە: پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ باڵابەرزێكی زۆر دیار نەبووە و كورتە باڵاش نەبووە، وە ڕەنگی نەسپیەكی تێر بووەو نە ئەسمەر بووە، وە قژ ی زۆر لول و زۆر خاویش نەبووە، خوای گەورە لە تەمەنی چل ساڵیدا كردی بە پێغەمبەرو لە شاری مەككەدا (دە) سا ڵ.[لە ریوایەتێكیدا سیانزە ساڵ، كەواتە لێرەدا زیادەكەی نەفەرمووە] مایەوەو لە شاری مەدینەش دا (دە) ساڵ. وە خوای گەورە لە تەمەنی شەست ساڵیدا گیانی كێشا [لێرەدا ڕاوی سێ ساڵە ز یادەكەی نەفەرمووە. لە ڕیوایەتێكیدا هاتووە: لە شەست و سێ ساڵیدا] وە لە سەرو ڕیشیدا(٢٠) تاڵ مووی سپی تێدا نەبووە ٠

( ٢٠ ) (**كا ن رسول الله ﴿ﷺ﴾ أ بيض مليح الوجه**) رواه مسلم .

واتە: پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ دەم و چاوو ڕووی سپیەكی گەشاوەو جوان بووە ٠

**وعن أبى هريرة (τ) قال : (كان رسولُ الله ﴿ﷺ﴾ أبيض، كأنما صيغ من فِضةِ، رَجِلَ الشَّعر)**.رواه الترمذي واسناده ضعيف لكن الحديث صحيح لأن له شواهد كثيرة وهو في الصحيحة (٢٠٥٣)

واتە :پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ سپی كارێك بوو دەتوت بەزیوو قاڵ دراوەو قژێكی زۆری هەبوو .

ڕیشـی پـیرۆزی پڕبـووەو ڕەنگـی ڕووی سـووری‌یەکی پێـوە دیـار بـووە[21]. لاشـەی مامناوەنـدو جـوان بـووە، لـە ڕۆیشـتنـدا کـەمێك بـەرەو پێشـەوە ڕەوتـی دەکـرد بـە وێنـەی کەشـتی[22]چوارشـانە بـووەو شـانەکانی پـان و لەیـەك دوور بووەو قـژی هـەتا نـەرمایی گوێچکەکانی (یـان تـانزیکی ناوشـانی) هـاتبوو[23] پەنجــەو لــەپی دەســتی‌و هــەردووقاچ و ســەری پــیرۆزی گــەورە بــووە ،

---

(٢١) **( كان رسول الله (ﷺ) مربوعاً، عريض ما بين المنكبين، كث اللحية، تعلوه حُمرة، جُمَّته إلى شحمة أُذنيه، لقد رأيته في حُلَّةٍ حمراء، ما رأيت أحسن منه)** رواه البخاري.

واتـە: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) چوارشـانە بـوەە، نێـوان هـەردوو شـانی پـان بـوو، مـووی ڕیشــی پڕبـوو، وە سـورایی‌یەکی پێـوە دیـارو زاڵ بـوو، وە قـژی گەیشـتبووە نـەرمایی هـەردوو گـوێ یـەکانی، لـە دوو پۆشـاکی سـووری خەتـداردا بینـیم هـەرگیز لـەو جـوانترو چاکترم نەدیووە .

**(٢٢)عن أنس قال : (كان رسول الله (ﷺ)رَبعةً، ليس بالطويل ولا بالقصير، حسن الجسم، وكان شعرُهُ ليس بجعد ولا سبط، أسمر اللون، إذا مشى يتكفَّأ )**.البخاري ومسلم (٢٣٣٨) والترمذي و غيرهم وهو صحيح.

واتە: پێغەمبەری خوا(ﷺ) لاشەی مامناوەند بـوو نەدرێـژ و نـەکورت، لاشـەی جـوان و ڕێك بووە، قژێکی هەبوو نە لـول و نـەخاو .ڕەنگـی کـەمێك ئەسمـەر بوو، کـە بڕۆشـتایە بە ڕێدا کەمێك بەپێشەوەدا ڕەوتی دەکرد.

**(٢٣) البراء بن عازب يقول: (كان رسول الله (ﷺ)رَجلاً مربوعاً، بُعَيدَ ما بين المنكبين، عظيم الجُمَّــة إلى شــحمة أُذنيــه، عليــه حُلــة حمــراء مــا رأيــت شــيئاً قــط أحســن منه)** أخرجه البخاري ومسلم (٢٣٣٧) وأبو داود والنسائي وابن ماجه والترمذي .

واتە:پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) پیـاوێکی چـوار شـانە بـوو، نێـوان شـانەکانی دوور بـوون لەیەکـەوە، قـژی درێـژ بـوو تانـەرمایی گـوێی هـاتبوو، دووپۆشـاك (دامـێن و سـەرامێن) ی سووری (خەتداری) لەبەردا بوو لەو جوانترم نەبینیوە.

**وفي رواية عنه قال: (ما رأيت من ذي لمةٍ في حُلة حمراء أحسن من رسـول الله (ﷺ). لـه شعر يَضربُ منكبيه، بُعيد ما بين المنكبين، لم يكن بالقصير ولا بالطويل).**

واتـه: کەسـم نـەبینیوە کەقـژی درێـژو بەردابێتـەوە و پۆشـاکی سـووری لەبـەردابێت و جوانتربێت لەپێغەمبەری خوا(ﷺ)، قژێکی هەبوو دەگەیشتە ناوشانەکانی، شانەکانی لەیەك دوور بوون و نەکورت و نە زۆر بالاّ بەرز نەبووە.

هەروەها سەری ئێسقانەکانیشی. وە مووی سەرسینگی تا کەلەکەی درێژ بوو بووە[٢٤]. دەمی پیرۆزی گەورەو قلّیشی چاوەکانی درێژو پاژنەی قاچی کەم گۆشت بووە[٢٥] لە مانگ جوانتر بووەو شێوەی لە ڕۆژو مانگ چووەو شێوەی

---

(٢٤) **عن علي بن أبي طالب قال: (لم يكن النبي (ﷺ) بالطويل ولا بالقصير، شَثْنُ الكفين والقدمين، ضخم الرأس، ضخم الكراديس، طويل المَسربة، إذا مشى تكفّأ تكفـؤاً كأنما ينحط من صَبَب، لم أر قبله ولا بعده مثله (ﷺ)).** رواه الترمذي (٣٦٤١) وقال :حديث حسن صحيح .وصححه الحاكم (٦٠٦/٢) و وافقه الذهبي و سنده ضعيف لكن له طرق أخرى يتقوى بها عند أحمد وابن سعد في الطبقات (٤١٠/١-٤١١).

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) نە درێـژو نـە کورتـە بـالاّ نـەبووە، دەسـت و پەنجـەو هەردووقاچیو سەری پیرۆزو سەری ئێسقانەکانی گەورەبوو، مووی سـەر سینگی تا کەلەکەی درێژ بوو بووەوە، کە دەرۆیشـت ئەمەنـدە بـە ڕێـك و جوانی دەڕۆیشـت دەتوت قاچی لە زەوی نادات، نە لە پێش ئەوداو نە لـەدوای ئـەودا کەسـم نـەدیووە بەوێنەی ئەو (ﷺ).

(٢٥) **جابر بن سمرة يقول:(كان رسول الله (ﷺ) ضَلَيع الفَمِ، أشكَلَ العينين، منهوس العقب) قال شعبة : قلت لسماك: ما(ضليعَ الفـم)؟ قـال: عظـيم الفـم .قلـت: مـا (أشـكل العينين)؟ قال: طويل شق العين . قلت: ما(منهوس العقب)؟ قال: (قليل لحم العقب ).** رواه مسلم (٢٣٣٩) و الترمذي و الطيالسي وأحمد .وهو صحيح .

واتە: پێغەمبەری خـوا(ﷺ) دەمـی گـەورەو قلّیشـی چـاوی درێـژو پاژنـەی پـێی کەم گۆشت بووە .

شعبه دەڵێ: به (سەماك )م وت: (ضليع الفم ) چیيه؟ فەرموی: واته دەمی گەورە بووه.وتم: ئەی (أشكل العينين )چیيه؟ فەرموی : قڵیشی چاوی درێژبووه، وتم: ئەی (منهوس العقب )چیيه؟ فەرمووی: پاژنەی پێی کەم گۆشت بووه .

(ڕووی) پیرۆزو دەم و چاوی خڕ بووه[٢٦] . وه زۆر لە(ابراهیم) پێغەمبەر(υ) چووه.[٢٧]

---

(٢٦)**عن جابر بن سمرة قال: ( رأيت رسول الله ﴿ﷺ﴾ في ليلة إضحيان، و عليه حلة حمراء. فجعلت أنظر إليه وإلى القمر، فلهو عندي أحسنُ من القمر )**الترمذي(٢٨١٢)و الدار مي و ابو الشيخ و الحاكم و صححه و وافقه الذهبي و الطبراني .و صححه الالباني . **واته: له شەوێکی ڕۆشنی مانگه شەودا پێغەمبەرم ﴿ﷺ﴾ بینی وه دووپۆشاکی سووری خەتداری لەبەردابوو .منیش تەماشای ئەو و تەماشای مانگەکەم دەکرد . ئەوم بەلاوه جوانتر بوو لەمانگەکه .**

**وعن أبى إسحاق قال : سأل رجل البراء بن عازب: أكان وجهُ رسولِ الله ﴿ﷺ﴾ مِثلَ السيف ؟ قال: (لا.بل مثل القمر)** البخاري والترمذي (٣٦٤٠)وغيرهم هو صحيح .

**واته :پیاوێك پرسیاری کرد له (بەڕائی کوری عازب): ئایا ڕووی پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ وەکو شمشێر وا بووه ؟ فەرمووی: نەخێر وەکو مانگ وابوو .**

**-(كان وجهه مثل الشمس والقمر وكان مستديراً )** رواه مسلم .

**واته: ڕووی وەکوخۆرو مانگ جوان بووەو لەوانه چووەو دەم وچاوی خڕ بووه.**

(٢٧)**عن جابر بن عبدالله أن رسول الله ﴿ﷺ﴾ قال :((عُرِضَ علي الأنبياء، فإذا موسى (υ) ضَربٌ من الرجال، كأنه من رجال شنوءة، و رأيت عيسى إبن مريم (υ) فإذا أقرب من رأيت به شبهاً عروة بن مسعود، ورأيت إبراهيم (υ) فإذا أقرب من رأيت به شبهاَ صاحبكم (يعنى نفسه). ورأيت جبريل (υ) فإذا أقرب من رأيت به شبهاً دِحية).** مسلم (١٦٧) والترمذي (٣٦٥١)وأحمد، انظر (الصحيحة) (١١٠٠) .وهو صحيح

**واته :پێغەمبەرانم نیشاندرا: موسام (υ) بینی پیاوێکی تەواو بوو ئەتوت له پیاوانی (شەنوئەته) [هۆزیکه لەیەمەن، خەڵکی ئەم هۆزه مام ناوەندن نەقەڵەوو نەلاواز]. وه عیسای کوڕی مەریەم(υ)م بینی ئەو کەسەی من بینیبێتم و زۆر لەو چووبێت(عروەی کوڕی مەسعود) ه [که ثەقەفییەو ئەو کەسەیه که قوڕەیش له ڕۆژی حودەیبیەدا ناردیان بۆلای پێغەمبەر﴿ﷺ﴾. ساڵی (٩)یکۆچی موسڵمان بووه.وه یەکێکه لەو دووکەسەی که قوڕەیش له بارەیانەوه دەیانووت :﴿** لولا نُزّلُ هذا القران على رجلٍ من القريتين عظيم ﴿ الزخرف /٣١ **] وه ئیبراهیم (υ)م بینی ئەو کەسەی زۆر لەو چووبێت هاوەڵەکەتانه (واته خۆی). وه (جبریل)م(υ) بینی ئەو کەسەی زۆر لەو چووبێت (دوحەیه)یه [دحیه الکلبی**

هاوەڵێکە لەگەڵ پێغەمبەردا ﴿ﷺ﴾ بەشداری جەنگەکانی دوای (بەدر) بووە و بەیعەتی ژێر دارەکەی داوە . زۆر جار جبریل(u) لە سەر شێوەی ئەمدا دەهات بۆلای پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾. چووە شام و لە (المِزَّة)مایەوە تا لەزەمانی (معاویە)دا وەفاتی کردو نوێنەری پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ بوو کە ناردی بۆلای (هِرَقل)و لە (حیمص ) پێ ی گەیشت].

**ئەمەندە خۆشەویست بوو جاری وا بووە کافرانیش هۆنراوەیان وتووە بەسەری دا.(٢٨) دەم و چاوی ڕۆشن و نورانی بووە. نە قەڵەوو نە لاواز نەبووە، چاوی زۆر ڕەشایی بووە. برژانگیچاوە جوانەکانی درێژ بووە.**

---

(٢٨)چەند جوانە کە یەکێك لە وەسفیدا دەڵێت :

**وأبيض يستسقى الغمام بوجهه ثمالُ اليتامى عصمة للأرامل**

واتە: سپی کارێکە و داوای دوعاکردنی لێ دەکرێ کە بۆ باران بارینی بکات. خواردن بەخشەرە بەهەتیوان و پارێزگاری کەری بێوەژنانە لەستەم لێ کردنیان.

ئەم هۆنراوەیە لە قسەکانی (أبو طالب)ی مامێتی .کە ابن عمر (τ) و غەیری ئەو دەیانووتەوە کاتێ موسڵمانان تووشی باران نەبارین ئەهاتن. پێغەمبەریش ﴿ﷺ﴾ دەپاڕایەوە بۆیان و دەیفەرموو: ((**اللهم اسقنا**)) خوایە تێر ئاومان بکەوبارانمان بۆ ببارێنە. ئەوەبوو بارانیان بۆ باری / رواه البخاري

هۆی ووتنی شیعرەکەی (ابو طالب) لە وەسفی پێغەمبەردا ﴿ﷺ﴾ ئەوە بوو: ساڵێك باران نەباری و ئەبو طالبیش پێغەمبەری ﴿ﷺ﴾ بە منداڵی هێنا لەلای کەعبەدا پشتیدا بە کەعبەوەو پەنجەی بەرز کردەوەو پاشان پاڕایەوە، ئەوەبوو باران باری، تەواوکەری شیعرەکەی کە لەخۆشی ئەوەدا ووتی ئەمەیە :

**يلوذ به الهُلاّك من آل هاشم فهم عنـده في نعمة وفواضلِ**
**كذبتم وبيت الله يُبزى محمدٌ و لما نقاتـل دونه ونناضل**
**ونسلمـه حتى نُصرَّع حـوله ونذهَل عن أبنائنا والحلائل**

وە پیاوێکی هۆزی (کنانة) هۆنراوەی دەهۆنیەوە و دەیوت :-

**لك الحمد ،والحمد ممن شكر سُقينا بوجه النبى المطر**
**دعـا الله خـالـقه دعـوة إليه وأشخص منه البصر**
**فلـم يك إلا كـإلقـا الـرداء وأسـرع حتـى رأينا الدرر**

وكـــان كمـــا قــــــال لــــه عــمه | أبو طــالب أبيـض ذو غُرر
به الله يسقى صـوب الغـمـام | وهذا العيـان لذاك الخبر
فمـن يشـكر الله يلـق المزيــد | و من يكفر الله يلق الغِيَرْ

(نقلاً من كتاب منال الطالب لإبن الأثير ص ١٠٦)

دەنگی خۆش بووەو صەدای تێدا بووە، گەردنی بەرز بووە، هەردوو برۆی درێژو چەماوە بووەو نزیکبووە بگەن بە یەك، بە هەیبەت و ویقار بووە، قسەکانی دەتوت مووروی ڕێکخراوە بە دوای یەکدا دێن، ڕووی لە کەس هەڵنەدەکردو قسە بەتاڵ نەبووە(٢٩)

---

(٢٩)هەموو ئەمانە لە فەرموودە درێژەکەی (أم معبد )دا هاتووەو ئەمانە لە وەسفی (أم معبد )ە بۆی، کە بەسەرهاتەکەی بەم شێوەیەیە:

پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ ئەبو بەکرو خزمەتکارەکەیو ئەو چاوساغەی لەگەڵیاندا بوو لەمەککەوە دەرچوون. لەرێگایاندا بەرەو شاری مەدینە بەلای دوو ڕەشماڵ(خێمە)ی ئافرەتێکی پیردا تێپەڕ دەبن کە ناوی (أم معبد)ەو لە نزیك ڕەشماڵەکەیەوە دانیشتووەو خواردنەوەو خواردن دەدا بە خەڵك، ئەمانیش داوای خواردنی (گۆشت و خورمای )لێ دەکەن هەتا لێی بکڕن، بەلام هیچیان لە لایدا نەبینیەوە، پێغەمبەریخوا(ﷺ) تەماشای مەڕێك دەکات لە سوچێکی ڕەشماڵەکەدایە، دوای ئەوەی هیچ توێشویان پێ نەماوەو برسیانە .

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی :ئەم مەڕە چیە ئەی (أم معبد )؟

أم معبد: مەڕێکە بەهۆی لاوازی یەوە لەڕانەکە بەجێ ماوەو نەیتوانیووە دەرچێ بۆ لەوەڕ .

پێغەمبەر (ﷺ):ئایا شیری تێدا هەیە ؟

ام معبد :زۆر لەوە لاوازترە تا شیری تێدا بێت .

پێغەمبەر (ﷺ): ئایا ڕێگام ئەدەیت بیدۆشم .

أم معبد: باوك ودایکم بە فیدات بن، ئەگەر ئەتەوێت بیدۆشیت بیدۆشە .

پێغەمبەر (ﷺ) مەڕەکە بانگ دەکات و دەست دەهێنێ بەسەر گووانیداو ناوی خوای گەورە دەهێنێو دەپاڕێتەوە بۆ (أم معبد) لەمەڕەکەیدا. هەتا مەڕەکە هەردوو قاچی

بلاودەکاتەوەو گوانی پڕ دەبێت لە شیرو ئامادەیە بۆ دۆشین، پێغەمبەریش(ﷺ) داوای جامێکی گەورە دەکات و دەست دەکات بە دۆشینی تاپڕ دەبێت، پاشان دەرخواردی ئافرەتەکەی دەدات هەتا تێر دەخواتەوە، وە دەرخواردی هاوڕێکانی دەدات تا تێردەخۆنەوە، پاشان خۆشی کۆتا کەس دەیخواتەوە، پاشان جارێکی تر دەست دەکاتەوە بە دۆشینی تا دەفرەکە(جامەکە)پڕ دەکات و لەلایان جێی دەهێڵێو پارەی ئەوەی دەداتێ و دەردەچن و دەڕۆن ..

پاش کەمێك هاوسەری ئافرەتەکە کە ناوی(أبو معبد)ە دەگەڕێتەوەو ڕانەمەڕە لەڕو لاوازەکانی پێش خۆی داوە کە لەلاوازیدا بەملاولادا دەکەون، تەماشا دەکات شیر دەبینێ !!

أبومعبد (بەسەر سوڕمانەوە)دەڵێ :ئەم شیرەت لە کوێ بوو (أم معبد)؟ خۆ مەڕەکەمان نەهاتووە بۆ لەوەڕو هەتا ئێستا نەزاوەو شیردەریش لەماڵەکەدا نی‌یە ؟!!!

ام معبد :نەخێر " سوێند بەخوا پیاوێکی پیرۆز بەلاماندا تێپەڕیو حاڵ و حسابێکی ئاوابوو.بەسەرهاتەکەی بۆ دەگێڕێتەوە.

ابو مەعبەد: دەسا (أم معبد ) وەسفی ئەو پیاوەم بۆ بکە بزانم سیفەتی چۆن بوو .

ئەوجا (أم معبد) وەسفی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەکات و دەڵێت:

(**رأيت رجلاً ظاهر الوضاءة**): پیاوێکم بینی ڕۆشنایی ئاشکراو دیاربوو .

(**أبلج الوجه**): ڕووی نورانی و پرشنگدار بوو .

(**لم تعبه نُحلَة ولم تزر به صقلة**): لاشەی نەزۆر لاوازو نەزۆر قەڵەوو ئەستوور بوو.

(**وسيمٌ قسيمٌ في عينيه دعج** ): جوانێکی نورانی بوو لەچاویدا ڕەشایی‌یەکی زۆری تێدابوو. واتە:چاوی ڕەش بوو.

(**وفي أشفاره وطف** ): برژانگی چاویشی درێژ بوو .

(**وفي صوته صهل**): لە دەنگیدا صەداو خۆشی‌یەکی تێدا بوو .

(**وفي عنقة سطع** ): مل وگەردنی بەرزو درێژ بوو .

(**وفي لحيته كثاثة**): ڕیشی درێژو پڕبوو .

(**أزجٌّ أقرَن**): هەردووبرۆی درێژ وچەماوەبوو نزیك بوو بدەن لەیەك .

(**إن صمت فعليه الوقار**): ئەگەر بێ دەنگ بوایە ویقارو ڕێزی لێ دەباری .

(**وإن تكلم سما و علاه البهاء**): وه ئەگەر قسەی بکردایە بڵندیو کەشخەیو هەیبەتی پێوە دیار بوو .

(**أجمل الناس وأحسنهم من قريب**): لەدوورەوە لەگشت خەڵکی جوانترو بە بەهاترینیان بوو .

(**حلوُ المنطق**): ووشەوقسە کانی شیرینەو شیرینگۆبوو .

(**فصَلٌ لانَزْرٌ ولاهَذر**): بەین دەخاتە نێوانیەوەو قسەکانی ڕۆشن ومامناوەندە( واتە نە زۆر قسە دەکات، وە مە زۆر بێ دەنگ و بێ قسەیە).

(**كـأن منطقـه خـرزاتُ مـنظم يتحـدرن**): قسـەکانی ئـەتووت مـورووی ڕێکخـراوە بـە دوای یەکدا دێن .

(**رَبعة لا يأس من طول**): چوارشانەیەکە نەزۆر باڵا بەرزو درێژە .

(**ولاتقتحمه عين من قصر**): وەنە زۆر کورتە باڵاو ناسازە لەبەرچاودا .

(**غُصن بين غصنين**): لەو نێوانەدایە .

(**فهو أنظرُ الثلاثة منظراً، وأحسنهم قدراً**): لە هەرسێ کەسەکەدا لە هەموویان جوانترو بە قەدرو شکۆتر بوو.( ئەو سیانەش: پێغەمبەر(ﷺ)و ئەبوبەکرو دەلیلەکەیان بوو)

(**له رفقاء يَحفون به**): کۆمەڵە هاوڕێیەکی هەیە دەوریان داوە .

(**إن قال، أنصتوا لقوله**): ئەگەر قسە بکات" گوێی بۆ ڕادەگرن .

(**وإن أمرَ تبادروا لأمره**): وە ئەگەر فەرمان بدات هەڵپە دەکەن بۆ جێبەجێ کردنی .

(**محشود محفود** ): کۆمەڵە هاوڕێیەکی هەیە گوێ ڕایەڵن بۆی وخۆشیان دەوێ .

( **لاعابس ولامُفَنَّد**)؛ ڕوولە کەس هەڵناکات و ووتەکانی دوورە لە بەتاڵ وئەفسانە .

أبومعبد فەرمووی :سوێند بەخوا ئەوە هاوەڵەکەی قوڕەیشە کە بۆمان باسکراوە لە بارەیەوە لە مەککەدا، وە ویستم وابووە کەهاوەڵایەتی بکەم و ئەگەر ڕێگام دۆزیەوە بۆ ئەوە ئەوا وادەکەم .

ئیتر بەیانی دەنگێکی بەرز لە مەککەدا هاواری دەکرد بەجۆرێ دەیانبیست و نەیاندەزانی کێیەو دەیفەرموو :

| | |
|---|---|
| **جزى الله رب الناس خيرَجزائه** | **رفيقين قالا خيمتي أم معبد** |
| **هما نزلاها بالهدى ،واهدت به** | **فقد فاز من أمسى رفيق محمد** |

حديث حسن قوى أحرجه الحاكم وصححه ،ووافقه الذ هبي

إبن كثير دەفەرموێ :بەسەرهاتەکەی أم معبد مەشهورو بڵاوەو ڕیوایەت کراوە لەچەند ڕێگایەکەوە کە یەکتری تێك هەڵکێش بەیەك دەکەن و یەکتری بە هێز دەکەن.

## مۆری پێغەمبەرایەتی یەکەی ﴿ﷺ﴾

مۆری پێغەمبەرایەتی بە پشتی پیرۆزی یەوە بوو لە نێوان هەردوو شانی دا لە هێلکەی کۆتر چووە[٣٠] پارچەیەکی سوور[٣١] وە بەرزبووەوە بووە[٣٢] .لە لاشەی پیرۆزی چووە[٣٢] .

---

(٣٠)**السائب بن يزيد يقول : (ذَهَبَتْ بي خالتي إلى النبي ﴿ﷺ﴾ فقالت: يارسول الله! إنَّ ابن أختي وَجِع ،فمسح ﴿ﷺ﴾ رأسي ، ودعا لي بالبركة، وتوضأ ،فشربت من وضوئه، وقمتَ خلَف ظهره، فنظرت إلى الخاتم بين كتفيه، فإذا هو مثل زِرُّ (الحِجْلَةِ)** رواه الترمذي (٣٦٤٦)والبخارى ومسلم (٢٣٤٥) وقال الترمذي :حسن صحيح غريب .وهو حديث صحيح .

**واتە: پورم (خوشکی دایکم ) بردمی بۆلای پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ وەعەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خوا ئەم خوشکەزایەم نەخۆشە. ئەویش دەستی هێنا بە سەرمداو پارایەوە بۆم بەبەرەکەت و دەست نوێژی شۆرد منیش لەئاوی دەست نوێژەکەیم خواردەوەو لە پشتی یەوە وەستام، تەماشای مۆرەکەیم کرد لە نێوان هەردوو شانی دا ئەتوت هێلکەی (الحجله)یە [کە باڵندەیەکی ناسراوە].**

(٣١)**عن جابربن سمرة قال :( رأيت الخاتَم بين كتفَي رسول الله ﴿ﷺ﴾ غُدَّةً حمراء مثل بيض الحمامة)** رواه الترمذي (٣٦٤٧)ومسلم (٢٣٤٤)والطبراني . وهوحديث صحيح .

**واتە: مۆری پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرم ﴿ﷺ﴾ بینی لە نێوان هەردوو شانی دا پارچە گۆشتێکی سوور بوو بە وێنەی هێلکەی کۆتر [مەبەستی لەقەبارەو ئەندازەدا ، یان لە وێنەو ڕەنگ دا].**

(٣٢)**عن أبى نضرة العوقى قال : سألت أباسعيد الخدري عن خاتم رسول الله ﴿ﷺ﴾؟ يعني خاتم النبوة، فقال:(كان في ظهره بَضعةً ناشزة).** رواه الترمذي، وسنده جيد.وله في (المسند)٣ /٦٩ طريق أخرى. و حسنه الالباني .

**واتە:ئەبی نەضرە دەفەرموێ: پرسیارم کرد لە ئەبوسەعیدی الخودری دەربارەی مۆری پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾؟ ئەویش فەرمووی: بەپشتی یەوە بوو پارچەیەك گۆشتی دیاری بەرزو هەڵئاوساو بوو .**

(٣٣)**عن جابر بن سمرة قال: (رأيت الخاتم بين كتفي رسول الله ﴿ﷺ﴾ غدة حمراء مثل بيضة الحمامة يشبه جسده)** رواه مسلم .

واته :مۆرەکەیم بینی لەنێوان هەردوو شانیدا بوو، پارچە گۆشتێکی سوور بە وێنەی هێلکەی کۆتر لە لاشەی پیرۆزی دەچوو .

ئەو مۆرە بەلای ناوشانی چەپی‌یەوە بوو، بەئەندازەی مستێکی دەست. خاڵی ڕەش باوی بەدەورەوە بووە، وەکو بالوکە (ثآلیل) وابووە[٣٤]. وە کۆمەڵە موویەکی کۆبووەوەی پێوە بووە[٣٥] .

---

(٣٤)**عن عبدالله بن سَرجِس قال: (أتيتُ رسول الله ﴿ﷺ﴾ وهو في ناسٍ من أصحابه، فَدرتُ هكذا من خلفه، فَعَرَفَ الذي أريد،فالقى الرداء عن ظهره، فرأيتُ موضعَ الخاتم على كتفيه مثل الجُمع حولها خِيلان كأنها ثآليل، فرجعت حتى استقبلتُه. فقلت:غفر الله لك يارسول الله.فقال: ((ولك)).فقال القوم: استغفرلك رسول الله ﴿ﷺ﴾. فقال :نعم، ولكم، ثم تلا هذه الآية** ﴿ واستغفِر لذنبك وللمؤمنين والمؤمنات ﴾ محمد/١٩). رواه مسلم (٢٣٤٦) وأحمد و ابن سعد . حديث صحيح .

واتە: عبداللەی کوڕی سەرجیس دەفەرموێ: چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ لەکاتێکدا لە ناوکۆمەڵێك لە هاوەڵەکانیدا بوو، بەم شێوەیە سووڕامەوەو چوومە پشتی‌یەوە، ئەویش تێ گەیشت کە مەبەستم چی‌یە، بۆیە پۆشاکەکەی لەسەر پشتی‌لابرد ،منیش شوێنی مۆرەکەیم بینی لەنێوان هەردووشانیدا وەکو مستێك وابوو چوار دەور درا بوو بەخاڵی ڕەش باو ئەتوت بالوکەیە، منیش چوومە بەردەمی ووتم: خوای گەورە لێت خۆش بێت ئەی پێغەمبەری خوا .فەرمووی: هەروەها لە تۆش خۆش بێت. خەڵکەکە پێیان ووت: پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ داوای لێ خۆش بوونی لەخوای گەورە بۆکردی، فەرمووی: بەڵێ، وەبۆ ئێوەشی کرد. پاشان ئەو ئایەتەی خوێندەوە کە دەفەرموێت: داوای لێخۆشبونی گوناهەکان بکە لە خوا بۆ خۆت و ئیمانداڕانی نێرومێ .

وە لە ریوایەتێکیدا دەفەرموێ :( **رأيت النبي ﴿ﷺ﴾ و دخلت عليه، وأكلت من طعامه، وشربت من شرابه، و رأيت خاتم النبوة في نُغْضِ كتفه اليسرى، كأنه جَمعُ خِيلان سود، كأنها ثآليل)** رواه مسلم . واتە :پێغەمبەرم ﴿ﷺ﴾ بینیوەو چوومەتەماڵەوە بۆلای‌و لە خواردن و خواردنەوەکەیم خواردووەو مۆری پێغەمبەرایەتیەکەیم بینیوە بە ناوشانی چەپی‌یەوە بوو. ئەتوت مستێك خاڵی ڕەش باوە هەروەك بالوکە وابوو .

(٣٥) **أبو زيد عمرو بن أخطب الانصارى قال: قال لي رسول الله ﴿ﷺ﴾: ((ياأبا زيد أُدنُ مني فامسح ظهري)).فمسحت ظهره، فوقعت أصابعي على الخاتم. قلت :وما الخاتم. قال: شعرات مجتمعات )** رواه الترمذي واسناده صحيح على شرط مسلم و رواه أحمد ٧٧/٥ و٣٤١ وابن سعد و صححه ابن حبان والحاكم و وافقه الذهبى و لفظهم: (شعرٌ مجتمع على كتفه) .حديث صحيح .

واتــه: أبوزيــد عــەمروی کــوڕی ئــەخطــەب دەفــەرموێ: پێغەمبــەری خــوا ﴿ﷺ﴾ پــێی فەرمووم: ئەبا زەید نزیك بەرەوە لێم و دەستێك بێنە بەپشتم دا. منیش دەستم بەپشتیدا هێنـاو پەنجـەکانم بـەر مۆرەکـە کـەوت. ووتم: مـۆر چـیيە؟. فـەرموی: کۆمەڵـە موويـەکی کۆبوەوە بوو .

## بۆنی خۆشی

ئارەقەی وەك مرواری وابووەو بۆنی خۆشتر بووە لـە میسك و عەنبـەر[٣٦] وە ئافرەتـە بـەڕێزە صـەحابيەکان (ڕەزای خوایـان لێ بێـت) ئارەقەکـەیان دەگـرت لـە جێی گوڵاو بەکاریان دەهێنا [٣٧] .

وە پێغەمبەری خۆشەویست ﴿ﷺ﴾ شوشەیەکی هەبوو گوڵاوی تێدابوو بۆ بـۆن خـۆش کردنــی خــۆی[٣٨] وەزۆر حــەزی لــە بــۆنی خــۆش دەکــردو ڕەتــی

---

(٣٦)**عن أنس (τ) قال: (كان رسول الله ﴿ﷺ﴾ أزهَر اللون، كأن عرقه اللؤلـؤ، إذا مشـى تكفأ، وما مسَسْتُ ديباجاً ولا حريراً ألين من كفّ رسول الله ﴿ﷺ﴾، و لا شممت مِسكاً و لا عنبراً أطيب من رائحة النبي ﴿ﷺ﴾)** متفق عليه

واتـه :پێغەمبـەری خـوا ﴿ﷺ﴾ ڕەنـگ کـراوە بـوو، ئارەقەکـەی بـە وێنـەی مـرواری بـوو .لەکاتی ڕۆشتنیدا بەرێگادا بەرەو پێشەوە ڕەوتی دەکرد، دەستم نەداوە لە هیچ دیبـاج و ئاوریشمێك کە نـەرمتر بوويێـت لـە بـەری دەسـتی پێغەمبـەر﴿ﷺ﴾. وەبـۆنی هـیچ میسك و عەنبەرێکم نەکردووە خۆشتر بوويێت لە بۆنی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ .

(٣٧) **عن أنس قال :(دخل علينا النبي ﴿ﷺ﴾ فقال عندنا فعـرِق، فجـاءت أمـي بقـارورة، فجعلت تسلُت العرق فيها، فاستيقظ النبي ﴿ﷺ﴾ فقال: ((ياأمَّ سليم، ماهذا الـذى تصـنعين ؟)) قالت: هذا عرقُك نجعلُه في طيبنا، وهو من أطيب الطيب)** رواه مسلم .

واتـه :ئەنـەس دەفـەرمووێ: پێغەمبـەری خـوا ﴿ﷺ﴾ هاتـە ماڵمـان و لـە کـاتی نیـوەڕۆدا سەرخەوێکی شکاندو ئارەقەی کردەوە. دایکیشـم شوشـەيەکی هێنـاو ئارەقەکـەی دەگـرت وتێی دەکرد، پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ بەخەبـەرهات و فـەرموی: ئـەی دایکـی سولەیم ئـەوە چی دەکەیت ؟ فەرمووی: ئەوە خەریکی ئارەقەکەتم ئەی پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ دەیگرم و دەیکەینە ناو عەترەکانمانەوە کە خۆی لە خۆشترین بۆن و عەترە .

(٣٨)**عن موسى بن أنس بن مالك عن أبيه قال: (كـان لرسـول الله ﴿ﷺ﴾ سـكه يتطيـب منها)**أخرجه ابوداود(٤١٦٢) واسناده صحيح على شرط مسلم. واخرجه ابن سعد وأبو الشيخ .وصححه الالبانى .

واتـه :پێغەمبـەری خـوا ﴿ﷺ﴾ شوشـەیەکی هـەبوو عـەتری تـێدەکردو خـۆی پـێ بـۆن خـۆش دەکـرد. [وە چـاك وایـە و پێویسـتە موسـڵمان خـۆی بـۆن خـۆش بکـات بـۆ ڕۆژی جومعەو جەژنەکان وئیحرام بەستن و کاتی نوێژی جەماعەت و ئاهەنگ و قورئان خوێندن و وەرگرتنی زانست و زیکرکردن].

نـەدەکردەوە[٣٩] فەرمانیشـی کـردووە کـە پشـتی وبـۆنی خـۆش و شـیر ڕەت نەکرێتـەوە[٤٠] وە دەیفـەرموو: بـا بـۆنی عـەتری پیـاو تیـژتر بـێ لـە عـەتری ئافرەت[٤١]

---

(٣٩)**عن ثُمامة بن عبدالله قال : كان أنس بن مالك لايرد الطِّيبَ. وقال أنس: (إن النبي ﴿ﷺ﴾ كان لايرد الطيـب).** أخرجـه أحمـد والبخـارى و الترمـذي (٢٧٩١) وقـال :حـديث حسـن صـحيح . و النسائي و ابن سعد و أبو الشيخ .وهو حديث صحيح .

واتـە: ئەنـەس هـەرگیز بـۆنی خۆشـی ڕەت نـەدەکردەوە کەدەیاندایـە. وە دەیفـەرموو :پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ هەرگیز بۆنی خۆشی ڕەت نەکردۆتەوە .

وەپێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ دەیفەرموو:**((حُبِّبَ إليَّ من دنياكم: النساء والطيب ، وجُعِلَتْ قُرَّةُ عَيني في الصلاة))**حديث صحيح رواه أحمد

واتە :لەو دونیایەی ئێوەدا ئافرەت و بـۆنی خۆشـم لاخۆشەویسـت کـراوە، وە ڕۆشـنایی چاوم بۆ خراوەتە ناو نوێژەوە .

**(٤٠)عن ابن عمر قال: قال رسول الله ﴿ﷺ﴾: ((ثلاث لاتُرَدُّ :الوسائد ،والدهن ،واللَّبَن)).**رواه الترمذى(٢٧٩١) واستغربه.قال الالباني: اسناده حسن .وهو في الصحيح (٦١٩) .حديث حسن .

واتـە :سـێ شـت ڕەت ناکرێتـەوە [لـە کـاتی میوانی وغـەیری میوانیـدا]:پشـتی و بـۆنی خۆش و شیر .

**(٤١) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله ﴿ﷺ﴾: ((طيبُ الرجال ماظهر ريحُه وخَفي لونه، و طيبُ النساء ماظهر لونُه وخَفيَ ريحُه))** رواه الترمذي(٢٧٨٨)وابوداود والنسائى وأحمد وقال الترمذي: حديث حسن .يعنى لغيره، وله شواهد منها عن عمران بن حصين عند أحمد ٤٤٢/٤ و أبو داود والترمذي (٢٧٨٩)وقال :حديث حسن غريب .وصححه الالباني .

واته :عەتری پیاوان ئەوەیە کەبۆنی تیژو دیاربێو ڕەنگی کاڵ بێت. وە بۆنی ئافرەتان ئەوەیە کە ڕەنگی تێرو دیارو بۆنی کەم بێت [وە ئەمیش بە مەرجێ نابێ ئافرەت بەو عەترو بۆنەوە بچێتە دەرەوە لە ماڵ بەڵکو تەنها بۆ مێرەکەی لە خۆی بدات ].

## شێوەی قژی پیرۆزی

قژی پیرۆزی پێغەمبەری خوا ﷺ هەتا نیوەی گوێچکەکانی (٤٢) یان تا سەر شانێو خوار نەرمی گوێچکەکانی دەهات (٤٣) قژی نەرم وبەردراوە بووە (٤٤) سەرەتا بەری دەدایەوەو بۆ خوارەوە دایدەهێنا، بەلاّم دوایی بەم لاولای ناوەراستی سەریدا دووبەشی دەکرد (٤٥)

---

(٤٢) **عن أنس بن مالك قال:(كان شعرُ رسولِ الله ﷺ إلى نصف (وفي طريق اخرى: أنصاف /٢٨) أذنيه )**رواه أبوداود (٤١٨٦) و النسائي و مسلم (٢٣٣٨)بلفظ: **(كان شعر رسول الله ﷺ بين أذنيه و عاتقه)**بأطول مما هنا وعند ابن ماجه (٣٦٣٤): **(كان شعر رسول الله ﷺ بين اذنيه و منكبيه)** و أحمد و ابن سعد .و هو حديث صحيح صححه الالباني.

واته :قژی پێغەمبەری خوا ﷺ هەتا نیوەی گوێچکەکانی دەهات . (لە ریوایەتی مسلم وابن ماجە)دا: هەتا نێوان گوێچکەکانیو گەردن یان شانەکانی دەهات .

(٤٣)**عن عائشة قالت :(كنتُ أُغتسل أنا و رسول الله ﷺ من إناء واحد، وكان له شعر فوق الجُمّة، و دون الوَفرة )**اخرجه ابن ماجه مفرقاً (٦٠٤) و (٣٦٣٥) و الترمذي (١٧٥٥) وصححه .وابوداود مفرقاً .وهو حديث صحيح صححه الالباني.

واته :من و پێغەمبەری خوا ﷺ پێکەوە لە یەك دەفر خۆمان دەشت، وە قژێکی هەبوو تا سەرووشانەکانیو خوار نەرمایی گوێچکەی هاتبوو.

(٤٤)**عن أُم هانيء بنت أبي طالب قالت: (قدم رسولُ الله ﷺ مكة قَدمةً وله أربعُ غدائر (وفي رواية: ضَفائر /٣٠)** رواه ابوداود (٤١٩١)وابن ماجه والترمذي وقال: حسن غريب . وأحمد وابن سعد، قال الالباني:واسناده صحيح.

واته :پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی هاتە ناوشاری مەککە چوارپەلکی قژی نەرمی هەبوو،[ ئەمیش (لە فەتحی مەککەدا) کە خۆی چوارجار هاتووەتە ناوی: بۆ عەمرەی القضاء و فەتح والجعرانة وحجة الوداع].

(٤٥)**عن ابن عباس :(أن رسول الله ﷺ كان يَسْدُلُ شعره، وكان المشركون يَفرِقون رؤوسهم، وكان أهلَ الكتاب يَسدُلون رؤوسَهم، وكان يُحب موافقةَ أهلِ الكتاب فيما لم يؤمر فيه بشيء، ثم فَرَقَ رسولُ الله ﷺ رأسَه).** البخاری ومسلم (٢٣٣٦)وابوداود وابن ماجة والترمذي وانسائي وابن سعد وأحمد .وهوحديث صحيح.

**واتە:پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ قژی بۆ خوارەوە دادەهێنا، وە هاوبەش پەیداکەرەکانیش قژیان لە ناوەڕاستی سەریاندا بەملاوبەولادا دادەهێنا، وە ئەهلی کیتابیش قژیان بەرەو خوار دادەهێنا، ئەمیش حەزی دەکرد موافەقەی ئەهلی کیتاب بکات لەوەدا کە فەرمانی پێ نەکراوە بە پێچەوانە جولانەوە لەگەڵیان. پاشان پێغەمبەریخوا ﴿ﷺ﴾ [قژی لە ناوەڕاستا یان لە تەنیشتەوە] بەملاولادا دادەهێنا .**

**وەهەندێ جار عائیشە ﴿ ڕەزای خوای لێبێت ﴾ بۆی دادەهێنا[٤٦] وە حەزی دەکرد بە دەستی ڕاستیو لە لای ڕاستی یەوە قژی دابهێنێت [٤٧] دەشی فەرموو تاونا تاوێك نەك هەموو ڕۆژێك [٤٨] وە مووە سپیەکانی بەزۆری لـــــــــــــــــــــــــــــــــــــەلای**

---

(٤٦)**عن عائشة قالت: (كنت أرجّل رأس رسول الله ﴿ﷺ﴾ وأنا حائض)** أخرجه البخاري ومسلم (٢٩٧) وعند أبي داود (٤١٨٩) : **(كنت إذا أردت أن أفرق رأس رسول الله ﴿ﷺ﴾ صدعت الفرق من يافوخة، وأرسل ناصيته بين عينيه)** وهو عند ابن ماجة(٣٦٣٣) وهوحديث صحيح صححة الالباني .

**واتە: لە عائیشەوە فەرمویەتی: من قژی پێغەمبەرم ﴿ﷺ﴾دادەهێنا لە کاتێکدا من لە حەیزدا بووم .**

**لە ریوایەتەکەی (أبوداود)دا دەفەرموێت: من ئەگەر بمویستایە قژی پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ دابهێنم، ئەوا لە ناوەڕاستی سەریدا قژیم جیادەکردەوەو بەملاولای ناوچەوانیدا بەرم دەدایەوە و دوو بەشم دەکرد .**

(٤٧) **عن عائشة قالت: (إنْ كانَ رسول الله ﴿ﷺ﴾ لَيُحِبُّ التَّيمُّنَ في طُهوره إذا تَطهر، و في ترجله اذا تَرَجَّلَ، وفي انتعاله إذا انْتَعَلَ.**اخرجه البخاري وزاد: **(وفي شأنه كله)**ومسلم (٢٥٨)وفيه الزيادة .وأبوداود (٣٣)والترمذي والنسائي وابن ماجه.حديث صحيح .

**واتە: پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ حەزی دەکرد لای ڕاست بەکار بهێنێ وپێش بخات لەدەست نوێژو خۆشتندا کاتێ خۆی دەشۆرد. وە لە قژ داهێناندا کاتێ دایدەهێنێ. وە لە کاتی نەعل و پێڵاو لەپێ کردنیدا کاتێ لەپێی دەکرد. وە بوخاری ئەمەی زیاد کردووە: وە لە هەموو کاروبار ێکی تری ژیانیدا.**

**(٤٨)عن عبدالله بن مُغَفَّل قال: (نهى رسول الله ﴿ﷺ﴾ عـن الترَّجـل إلا غِبّـاً).**
أخرجه ابوداود (٤١٥٩)والنسـائي (١٧٥٦) وابـن حبـان في صـحيحه، .وهـومخرج في الصـحيحه (٥٠١) وصححه الالباني .

**واته: پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ نەهی کردووە لەقژ داهێنان مەگەر ڕۆژنا ڕۆژێك و تاو نا تاوێك .**

**لاجانەکانیدا بووە[٤٩] لـە سـەرو ڕیشـیدا نزیکـەی چواردە(١٤)تاڵی سپی تێدا بووە[٥٠] تابیست(٢٠)تاڵ بووە، بە زۆری لە پێشەوەی ڕیشیدا[٥١] یان بە بڵاوی لـە سـەریدا بـووەو کـە چـەوری دەکـرد نـەدەبینرا [٥٢] وە فەرمویـەتی:**

---

(٤٩)**عن قتادة قال: قلت لأنس بن مالك: هل خَضَبَ رسولُ الله ﴿ﷺ﴾؟قال: (لم يبلغ ذلك إنما كان شيباً في صِدغَيه، ولكن أبوبكر (رضى الله تعالى عنه) خضب بالحنّاء والكَتَمِ).** اخرجه البخاري دون ذكر ابوبكر، ومسلم بتمامه وأبوداود و زاد: **(قد خضب أبوبكر و عمر)** و هوحديث صحيح.

**واتـه: قـەتادە دەفـەرموێ: لـە ئەنەسـم پرسـی: ئایـا پێغەمبـەری خـوا ﴿ﷺ﴾قژی ڕەنـگ کردووە بەسوور ؟ فەرمووی: نەگەیشتە ئەوە بەڵکو مووە سپییەکانی چەند تاڵێك بوو لە لاجانەکانیدا. بەڵام ابوبکر (ڕەزای خـوای لـێ بێـت) قـژی ڕەنـگ دەکـرد بەخەنـەو وسمـە (کَتْم) [کەڕەنگی قژ ڕەشێکی سوور باو لێ دەکات].وە لە ریوایەتی (ابوداود)دا: ئەبوبەکرو عومەر(ڕەزای خوایان لێ بێت) قژیان سوور دەکرد .**

(٥٠)**عن أنس بن مالك قال: (ماعَدَدْتُ في رأسِ رسولِ الله ﴿ﷺ﴾ ولحيتـه إلا أربَـع عشـرة شعرة بيضاء).** أخرجه ابن ماجه(٣٦٢٩) وأحمد، قـال الالباني:اسـناده صـحيح علـى شـرط الشـيخين . وهوحـديث صحيح .

**واتــه: لەســەرو ڕیشــی پێغەمبــەری خــوادا﴿ ﷺ﴾ تەنهاچـواردە تـاڵی مـووی سـپیم ژماردووە.**

(٥١) **عن عبدالله بن عمر قال:(إنما كان شيبُ رسـول الله ﴿ﷺ﴾ نحـواً مـن عشـرين شـعره بيضـاء).** أخرجـه ابـن ماجـه(٣٦٣٠) والترمـذي وأحمـد٢/٩٠ وصـحح البوصـيري في الزوائـد إسـناده، قـال الألبـاني: وهوصحيح لغيره.

**واته: تاڵە مووە سپییەکانی پێغەمبەریخوا﴿ﷺ﴾ نزیکەی بیست تاڵ دەبوو.**

**وعن أنس قال: (أنه لم ير من الشيب إلا نحو سبعة عشر أو عشرين شـعرة في مقدمـة لحيتـه ﴿ﷺ﴾)** ابن ماجه (٣٦٢٩).

واتە: لەمووی سپیحەڤدە یان بیست تاڵی سپی دەبینرا لەپێشەوەی ڕیشیدا بوو.

(٥٢)**عن سماك بن حرب قال: سمعت جابر بن سمرة وقد سُئل عن شيب رسول الله ﴿ﷺ﴾؟فقال: (كان إذا دَهَنَ لم يُرَ منه شيب، وإذا لم يَدهن رُؤي منه شيء)** وفي رواية: **(لم يكن في رأسِ رسولِ الله ﴿ﷺ﴾ شيبٌ إلا شعرات في مَفرَق رأسه، إذا ادّهن واراهُنَّ الدّهن).** رواه مسلم (٣٣٤٤)والنسائي والترمذي وهوفي الصحيحة (٣٠٠٤)واللفظ الآخر صححه الحاكم ٦٠٧/٢ ووافقه الذهبي .

واتە: ئەگەر سەری چەور بکردایە مووی سپی دیارنەبوو، بەڵام کە چەوری نەکردایە شتێکی لێ بەدەردەکەوت، وە لە ڕیوایەتەکەی تردا: لە سەری پێغەمبەردا﴿ﷺ﴾مووی سپی تێدا نەبوو مەگەر چەند تاڵێك بە پرژوبڵاوی کە چەوری دەکرد چەورییەکە دەیشاردەوەو لەملاو لای سەریدا بوو .

## سورەتی (هود)و هاووێنەو خوشکەکانی پیریان کردم [٥٣]وە تاڵە موەکانیشی سوور بوون[٥٤] چونکە ڕەنگی کردووە بە ڕەنگی سوور [٥٥]

---

(٥٣)**عن ابن عباس قال: قال ابوبكر: يارسول الله" قد شِبتَ. قال:((شَيَّبتني (هود) و (الواقعة) و (المرسلات)و (عمّ يتسَاءلون)و (إذا الشمس كورت) )).** رواه الترمذي (٣٢٩٣) وقال حسن غريب. وصححه الحاكم على شرط البخارى و وافقه الذهبي وصححه الألباني في الصحيحة(٩٥٥).

واتە: ابو بكرفەرموی : ئەی پێغەمبەری خوا پیر بویت .فەرموی : سورەتەکانی (هود والواقعه والمرسلات و عم و التكوير) پیریان کردم .

**وعن أبى جحيفة {قال}قالوا :يارسول الله !نراك قد شِبتَ .قال: ((قد شيبتني هود وأخواتُها)).** رواه الطبرانى أيضاً (الجامع الصغير) قال الألبانى : واسناده صحيح بما قبله .

واتە: وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا دەبینین پیربوویت. فەرمووی: سورەتی هودو خوشکەکانی پیریان کردم .

(٥٤) **عن أبى رِمثةَ التيمي تيم الرباب قال: أتيتُ النبي ﴿ﷺ﴾. و معي ابن لي. قال فأُرِيتُه. فقلت لما رأيته: (هذا نبي الله ﴿ﷺ﴾. و عليه ثوبان (وفي رواية: بُردان /٦٣) أخضران، وله شَعر قد علاه الشيب ،وشيبه أحمر).**أخرجه الترمذي (٢٨١٣)وحسنه، وأحمد وإسناده صحيح وصححه الحاكم ١٠٧/٢ والذهبى، و ابي داود (٤٠٦٥)بلفظ آخر و النسائي .

واتە: أبی ڕیمثە دەفەرموێ: چوومە خزمەت پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾و کوڕێکی خۆشم پێ بوو. دەفەرموێ: نیشانم داو ووتم: ئەوە پێغەمبەری خوایە ﴿ﷺ﴾. وە دوو پۆشاکی

خەتداری سەوزی لەبەردا بوو. قژیشی مووی سپی پێوە دیار بوو. تاڵە سپیەکانیشی سوورکردبوو .

(٥٥)**عن عثمان بن مَوهِب قال: (سُئِل أبوهريرة: هل خضب رسول الله ﴿ﷺ﴾ قال: نعم).** رواه الترمذي و صحححه الألباني ووصله البخاري، وابن ماجه عن أُم سلمة وأحمد ٢٩٦/٦ وابن سعد ٤٣٧/١ .

واتە: پرسیارکرا لە ئەبو هورەیرە کە ئایا پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ قژی ڕەنگ دەکرد؟ فەرمووی: بەڵێ.

وە عثمانی کوڕی عبداللە ی کوڕی مَوهِب ئەگێڕێتەوە لە ام سەلەمەوە کە: **(أنها أخرجت شعراً من شعر النبي ﴿ﷺ﴾ مخضوباً).** رواه البخاری وعند ابن ماجه (٣٦٢٣)قال: **(دخلت على أُم سلمة فأخرجت إلي شعراً من شعر رسولِ الله ﴿ﷺ﴾ مخضوباً بالحناء والكتم).**

واتە: چوومە لای أم سەلەمە ئەویش تاڵێك لە مووی پێغەمبەری﴿ﷺ﴾بۆدەرهێنام و پیشانیدام بینیم ڕەنگ کرا بوو بە خەنە و ووسمە .

**وعن أنس قال: (رأيت شعر رسول الله ﴿ﷺ﴾ مخضوباً).** قال الألباني اسناد صحيح على شرط مسلم وتفرد به الترمذي .

واتە: قژی پێغەمبەرم ﴿ﷺ﴾ بینی ڕەنگ کرا بوو .

**وعن عبدالله بن محمد بن عقيل، قال: (رأيت شعر رسول الله ﴿ﷺ﴾ عند أنس بن مالك مخضوباً).** قال الألباني: إسناده صحيح ايضاً إلى ابن عقيل وهوحسن الحديث .فالحديث حسن .

**<u>ڕوونکردنەوە:</u>** ئیمامی نەوەوی(ڕەحمەتی خوای لێ بێت)دەفەرموێ: ( کەواتە پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ لە هەرکاتێکدا بووبێ ڕەنگی قژی کردووە، وە فەرمودەکەی ابن عمر لە صەحیحەیندا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە زۆربەی کاتیش وازی لێ هێناوەو هەریەکەشیان هەواڵی ئەوەی داوە کە بینیویەتی کە ڕاست گۆیە والله اعلم)

ئیمامی البانی(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێ: اسنادی فەرمودەکەی ابن عقیل حەسەنەو اسنادی فەرموودەکەی انس صەحیحە وەك ڕابورد، بەڵام بە ڕووکەش پێچەوانەیە بە فەرموودەی ژمارە(٤٦)بە سەرجەم ڕێگاکانی کە ئاماژەم بۆکرد لە تەعلیقەکەدا لەسەر فەرمودەکەی دوای ئەو. وە هەندێکی لە ڕێگای حمیدەوە ریوایەت

کراوه که هەمان ڕاوی‌یه له ئەنەسەوه گێڕاویه‌تی‌یه‌وه، وه لەفزەکەشی: **(إن رسـول الله ﴿ﷺ﴾ لم يخضب قط ،إنما كان البياض في مقدم لحيته في العنفقة قليلاً ، وفي الرأس نبذ يسير لايكـاد يـرى).** رواه أحمد ٢٦٦/٣ وابن سعد ٤٣١/١ واسناده صحيح كما قال الحافظ في (الفتح – صفة صلاة النبي ﴿ﷺ﴾).

**واته: پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ هەرگیز ڕەنگی قژی نەکردوه، بەڵکو تاڵە سپی‌یەکانی لەپێشەوەی ڕیشی‌دا بوو لە ژێرلێوی‌دا کەمێك و لەسەری‌دا چەند تاڵێکی کەم کە بەئەستەم دیاربوو.**

**دەساچۆن ئەمە ڕێك دەخرێت لەگەڵ ئەوەدا کە فەرمووی: (رأيت شعره مخضوباً)؟ واته بینیم قژی ڕەنگ کرد بە سوور؟**

**بۆ وەلامیش وەك ابن عقیل خۆی دەیگێڕێتەوە ئەوەیە کە دەفەرموێ: (ئەنەسی کوری مالك هاتە مەدینە لەکاتێکدا عومەری کوڕی عبدالعزیز والی بوو. عومەر ناردی بەشوێنی‌دا وبە نێردراوەکەی فەرموو: لێی بپرسە ئایا پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ قژی ڕەنگ دەکرد؟ چونکە من تاڵێك لە قژیم بینیوە ڕەنگ کراوە .ئەنەسیش فەرموی: پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ تاڵەمووەکانی زۆربەی ڕەش بوو. ئەگەر ئەوتاڵانەی لەسەروڕیشی‌دایە لە سپی ژماردەم بکردایە لەیازدە (١١)تاڵ تێپەڕی نەدەکرد، بەڵکو ئەوەی پێی ڕەنگ کراوە لەو بۆن وعەترە بوو کە قژی پێغەمبەری ﴿ﷺ﴾ پێ بۆن خۆش دەکرا).** أخرجه الحاكم ٦٠٧/٢وقال : صحيح الأسناد.و وافقة الذهبي .

**البانی(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێ: منیش دەڵێم: لەسەر ئەمەوە فەرمودەکە لێك دەدرێتەوە کە ئەو ڕەنگ کردنەی ناوی هاتووە بریتی بووە لەبۆن وعەتر نەك خەنە . بەم شێوەیەش دژواریە ئاشکراکەی نێوان دوو فەرمودەکە نامێنێ " والله اعلم .**

**بەلام نەفی کردنی ئەنەس (τ) بۆئەوەی کەوا پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ بە خەنە سەری ڕەنگ کردبێ پێچەوانەیە لەگەڵ فەرمودەکەی أم سەلەمە کە لە ماناکەی‌دا وەردەگیرێ کە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بە خەنەو ووسمە سەری ڕەنگ کردوە. وە گومانیشی تێدا نی‌یە کە فەرموودەی (المُثبِت) پێش دەخرێت بەسەر (النافی)دا چونکە زیادە عیلمی تێدایە. وە زیادەش لە کەسی جێ متمانەو سیقەوە وەردەگیرێ وەکو چەسپاوە لە (علم الاصول)دا. لەبەر ئەوە پێویستە ئەو جەمعە بکەین کە پێشتر ئیمامی نەوەوی (ڕەحمەتی خوای**

لیٚبیٚت) باسی کردو هەمان شیٚوە الحافظ (واتە: ابن حجر) باسی کردوە لە (الفتح)داو لە پیٚش ئەویش الحافظ ابن کثیر لە (البدایة)دا.

**یاخود هەندیٚ جار ڕیشی ڕەنگ دەکرد بە ڕەنگی زەرد (٥٦) وە فەرموویەتی: مووەکانتان ڕەنگ بکەن، وەکو گاورو جولەکە مەکەن کە ڕەنگی ناکەن(٥٧) وەسووری بکەن یان زەردی بکەن(٥٨)**

---

(٥٦)**عن ابن عمر: (أن النبي ﴿ﷺ﴾ کان یلبس النعال السبتیه، ویصفر لحیته بالورس و الزعفران، وکان ابن عمر یفعل ذلك).** رواه النسائي وصححه الالبانی في المشکاة.

واتە: پیٚغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ نەعلی سەبتیەی لە پێ دەکرد [کە لە پیٚستە دروست دەکریٚت]. وە ڕیشی پیرۆزی زەرد دەکرد بە ڕەنگی (وەرەس) [کە ڕووەکیٚکی زەردە] وە زەعفەران. وە ابن عمریش هەر وای دەکرد .

(٥٧)وە پیٚغەمبەر﴿ﷺ﴾ دەفەرمویٚت:**((إن الیهود والنصاری لایصبغون فخالفوهم))**رواه البخاری.

واتە: گاورو جولەکەکان ڕەنگی مووەکانیان ناکەن ئیٚوە پیٚچەوانەیان بکەن .

**وقال﴿ﷺ﴾:((غیّروا الشیب ولا تشبهوا بالیهود))**اخرجه النسائي وقال محقق جامع الاصول:صحیح بشواهده.واتە: ڕەنگی مووە سپییەکانتان بکەن و وەکو جولەکە مەکەن وخۆتان مەشوبهیٚنن بەوان.

(٥٨)پیٚغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ دەرچووە دەرەوە بۆناو کۆمەڵیٚك لە پیاوە بە تەمەنەکانی ئەنصار کە ڕیشیان سپی بوو بوو فەرموی: **((یامعشر الأنصارحَمّروا أو صَفّروا، وخالفوا اهل الکتاب))** رواه أحمد وحسنه الحافظ في الفتح .

**واتــە: ئــەی کۆمــەڵانی ئەنصــار ڕەنگــی ڕیشــتان ســوور بکــەن یــان زەردی بکــەن و پێچەوانەی ئەهلی کیتاب بن .**

**تێبینی/ لە باسی ڕەنگ کردنی مووی سپیدا لەئیمامی ئەحمەدەوە – ڕەحمەتی خوای لێ بێت– نقڵ کراوە کە فەرمویەتی: واجبە. وەفەرمویەتی: ئەگەرچی یەك جاریش بێت دەبێت بکرێت. فەرمویەتی: پێم خۆش نییە هیچ کەسێك وازی لێ بهێنێ و خۆی بشوبهێنێ بە ئەهلی کیتاب. وە سەبارەت بە ڕەنگی ڕەش هەر وەکو شافعییەکان دوو ڕایان لێ دەگێڕنەوە: بڵاوەکەیان ئەوەیە کە دەڵێن مەکروهە، وە وتراویشە حەرامە . وە زیاتر تەئکید لەسەر مەنع دەکرێتەوە ئەگەر کەسێك بۆ هەڵخەڵەتاندن و چاوبەست کردن قژی ڕەش بکات** . انظر فتح الباري ١٠/٤٩ .

## کلی چاوی پێغەمبەر(ﷺ)

**پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمانی کردوە بە کل کردنە چاو[٥٩] بە تایبەتی لە پێش خەوتن دا[٦٠] .**

---

(٥٩) **عن ابن عباس أن النبي (ﷺ) قال:((اكتحلوا بالإ ثمد، فإنه يجلو البصر، وينبت الشعر)) وزعم أن النبي (ﷺ) كانت له مِكحلة يكتحل منها كل ليلة** (وفي رواية : **قبل أن ينام بالإثمد /٤٩) ثلاثةً في هذه و ثلاثة في هذه./** أخرجه الترمذي وابن ماجه في كتاب الطب (٣٤٩٧) و(٣٤٩٩) واخرج قسماً منة النسائي . قال الالباني :اسناده ضعيف جداً .كما بينته في إ رواء الغليل (٧٦)لكن الشطرالاول منه له طريق أخرى عن ابن عباس وشواهد .فهو بها صحيح وقد خرجتها في (الصحيحة)(٦٦٥ و٧٢٤) وغيرها ...

**واتە: کلی چاوتان بکەن بە بەردی (الإثمِد) [کە بەردی بە ناوبانگی کلە]،چونکە چاوڕۆشـن وڕون دەکاتـەوەو مـوو دەڕوێنـێ. ( تـائێرەی فەرموودەکـە صـەحیحە وئەمـەی تـری ضـەعیفـە: وەابـن عبـاس واگومـانی دەبـرد کـە پێغەمبـەر(ﷺ) کلدانێکی هەبووەو هەموو شەوێك پێش خەوتن چاوی پێکل دەکرد. سێجار بۆ چاوی ڕاستیو سێ جار بۆچاوی چەپی).**

(٦٠) **عن جابر هو ابن عبدالله قال: قال رسول الله (ﷺ): ((عليكم بـا لإثمِـد عنـد النوم، فإنه يجلوا البصر، وينبت الشعر))**اخرجه الترمذي وابوداود (٣٨٧٨) وفيه زيادة **((إلبسوا من ثيابكم البياض فإنها من خير ثيابكم وكفنوا فيها موتاكم))** وابن ماجه( ٣٤٩٧ و٣٨٧٨) و اخرجوه من حديث ابن عباس إلا ابن ماجه فقد اخرجه عن جابر أيضا (٣٤٩٦) وفي رواية الترمذي( ١٧٥٧) زيادة اكتحاله (ﷺ) عند النوم .

**واتـه: كلـى چاوتان بكـەن بـه بـەردە كل لـەكاتى خـەوتن دا . چونكه چاو ڕۆشن دەكات و موو دەروێنێ .**

## پۆشاكی پێغەمبەر (ﷺ)

**خۆشەویسترین پۆشـاك بەلایـەوە كـراس (قـەمیص) بـووە[٦١] وە پۆشـاكی (قَطَری) لەبەر دەكرد كە جلێكـی یەمەنیـیە[٦٢] وە كـە پۆشـاكی نـوێی لەبـەر دەكرد ناوی دەنا بەناوی خۆی سا ئیتر میزەر یان قەمیص یـان كـراس دامێن و داوای خێری لە خوای گەورە دەكردو پەنای پێ دەگرت[٦٣]**

---

(٦١) **عن اُم سلمة قالت: (كان أحبَّ الثياب إلى رسول الله (ﷺ) يلْبَسُـه القمـيصُ).** اخرجه أبوداود (٤٠٢٥) والترمذي (١٧٦٢) وقال :حديث حسن غريب . وابن ماجه (٣٥٧٥)وأحمد وأبوالشيخ والحاكم ٢/١٩٢ وقال : صحيح الاسناد . ووافقه الذهبي. وصححه الالبانى (تخريج المشكاة) (٤٣٢٨)تحقيق الثاني .

**واتـه: خۆشەویسـترین پۆشـاك بـەلای پێغەمبـەری خـواوە (ﷺ) بریتـی بـوو لـە كـراس (قەمیص).**

(٦٢)**عن أنس بن مالك: (أن النبي (ﷺ)(كان شاكياًف/١٢٧) خَرَجَ وهـوَ يَتَّكـيء علـى اُسامة بن زيد، عليه ثوب قطري قد تَوَشَّحَ به. فصلى بهم).**اخرجه الترمذي، قـال البـانى: حديث صحيح رجال ثقات. و رواه ابوالشيخ ص(١١٥)وأعاده الترمذى (١٢٧) مـن وجـه آخـرعن أنـس وفيـه زيـاده واسـناده صـحيح واخرجه ابن حبان (٣٤٩) من الوجهين وكذا أحمد (٣/٢٥٧ و ٢٦٢ و٢٨١).

**واتـــه: پێغەمبـــەری خـــوا(ﷺ) نـــەخۆش بـــوو لـــە مـــاڵ هاتـــە دەرەوەو خـــۆی دابـــوو بەسەرشانی ئوسامەی كوڕی زەید دا. وەپۆشاكێكی قیطری لەبەردابوو [كە قـەطـەرییـەو**

جۆرێکە لە پۆشاکی یەمەنی لە لۆکە دروست دەکرێت و سوورایی‌و خەتی تێدایە ]پۆشاکەکەی خستبووە سەرشانی‌و پێش نوێژی بۆ کردن .

(٦٣)**عن أبى سعيد الخدرى قال: كان رسول الله ﴿ﷺ﴾ إذا ستَجَدَّ ثوباً سماه باسمه. عمامةً أو قميصاً أو رِداءً ،ثم يقول: ((اللهم لك الحمدُ أنت كَسَوتنيه، أسالك خيره وخير ماصُنع له. وأعوذ بك من شرّه وشرّ ماصنع له))**أخرجه ابوداود(٤٠٢٠) والترمذي (١٧٦٧)وقال : حديث حسن غريب صحيح ،وابن حبان وأحمد وابن سعد وأبو الشيخ وزاد أبو داود:**(فكان اصحاب النبي ﴿ﷺ﴾ إذا لبس أحدهم ثوباً جديداً قيل له: تُبلي و يخلف الله تعالى)** قال الألباني: إسناده صحيح .

**واتە: پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ ئەگەر پۆشاکێکی نوێی لەبەر بکردایە بە ناوی خۆیەوە ناوی دەنا، سا مێزەر بووایە یان قەمیص یان کراس دامێن. پاشان دەیفەرموو: خوایە سوپاس و ستایش بۆ تۆیە تۆ پۆشتەت کردم، داوای خێرو چاکەی ئەم پۆشاکەت لێدەکەم [کەبریتی‌یە لە مانەوە لە ژیاندا]. وە ئەوخێرەی بۆی دروستکراوە [کە بریتی‌یە لە لادانی بەلای ئەو کارەدا کە ڕەزای خوای تێدایە]. وە پەنات پێ دەگرم لەخراپەکەی‌و خراپەی ئەوەی بۆی دروست کراوە [کە لادانێتی لەوەی بە خۆبەزلزانین و فیزەوە لەبەری بکات].**

**وە خۆشەویسترین جۆر بەلایەوە پۆشاکی(حِبَرَة) بووە کە جلێکی یەمەنی‌یە لە کەتان یان لۆکە دروست دەکرێت وجوان وخەتدارە.** (٦٤) **یان خەتدارە بە خەتی سوور**(٦٥)**وە دەیفەرموو پۆشاکی سپی لەبەربکەن**(٦٦)**یان هەندێ جار پۆشاکی (مرط)ی لەبەر دەکرد کە پۆشاکێکی درێژوفراوانە لە موو یان پەموو**

---

(٦٤)**عن أنس بن مالك قال:( كان أحبَّ الثياب الى رسول الله ﴿ﷺ﴾ يَلبَسه الحِبَرَةُ).** أخرجه البخارى ومسلم(٢٠٧٩) وابوداود(٤٠٦٠) والترمذى (١٧٨٨)وقال: حديث حسن صحيح غريب.

**واتە: خۆشەویسترین پۆشاکێك بەلای پێغەمبەرەوە ﴿ﷺ﴾ کە لەبەری بکات بریتی بوو لەپۆشاکی(حیبەرە) .**

(٦٥) **عن عون بن أبي جحيفة عن أبيه قال : رأيت النبي ﴿ﷺ﴾ وعليه حُلّةٌ حمراء، كـأني أنظر إلى بريق ساقيه) قال سفيان: أراهـا حِبَـرَة/**أخرجه البخاري في عدة مواضع من صحيحه، مطولاً ومختصراً، ومسلم (٥٠٣) و الترمذى وابن سعد وابوالشيخ وغيرهم انظر(صحيح أبي داود) (٥٣٣) .

واتە: پێغەمبەرم ﴿ﷺ﴾ بینی[ئەمەش لە بەطحاء ی نزیك مەككەدابوو] وە پۆشاكێكی سووری لەبەردابوو وەك ئەوە وایە ئێستا بریقەی قاچەكانی ببینم، سوفیان دەفەرموێ: پێم وابێ پۆشاكی (حیبەرە) بووە [واتە خەتدار بووە بەخەتی سوور] .

(٦٦)**عن ابن عباس قال: قال رسول الله ﴿ﷺ﴾: ((عليكم بالبَياضِ من الثياب، ليلبسها أحياؤكم. وكَفّنوا فيها موتاكم، فإنها من خِير ثيابكم))**رواه ابوداود (٤٠٦١) وابن ماجه (٣٥٦٦) والترمذي (٩٩٤) وقال :حديث حسن صحيح . وصححه ابن حبان . وهومخرج في (الجنائز و بدعها) ص ٦٢ .

واتە: پۆشاكی سپی لەبەربكەن .بازیندوەكانتان بیپۆشن و مردوەكانتانی تیاكفن بكەن، چونكە لە چاكترینی پۆشاكەكانتانە .

**وعن سمرة بن جندب قال: قال رسول الله ﴿ﷺ﴾: ((إلبسوا البياض. فإنها أطهر وأطيبُ، وكفنوا فيها موتاكم ))**اخرجه الترمذي (٢٨١١) وقال : حديث حسن صحيح . والنسائي وابن ماجه (٣٥٦٧) والطيالسي (١٨٠٠) وهوصحيح بما قبله .

واتە: پۆشاكی سپی لەبەر بكەن چونكە پاكترو جوانترە. وەكفنی مردووەكانتانی پێ بكەن.

یان لە كەتان دروست دەكرێت و دەپێچرێت لە خۆوە[٦٧]وە لە غەزای (تەبوك)دا جبەیەكی ڕۆمی لەبەر كرد بوو[٦٨] .

---

(٦٧)**عن عائشة قالت: (خَرَجَ رسولُ الله ﴿ﷺ﴾ ذاتَ غداة وعليه مِرطٌ من شَعر أسود)** اخرجه مسلم (٢٧٨١)وابو داود (٤٠٣٢)ولفظه : **(عليه مرط مرحل من شعر اسود)** والترمذي وأحمد وأبو الشيخ .

واتە: بەیانییەكیان پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ لەماڵ دەرچوو پۆشاكێكی (مرط)ی خەتداری لە بەردا بوو كە لە مووی ڕەش دروست كرا بوو .

(٦٨)**عن المغيرة بن شعبة: (أن النبي ﴿ﷺ﴾ لَبِسَ جبةً روميةً ضيقةَ الكُمَّين)** أُخرجه الترمذي (١٧٦٨) واخرجه الشيخان وبقية الستة . انظر (صحيح أبی داود) (١٤٦و١٤٧)

واتە: پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ [لە غەزای تەبوك دا] جبەیەكی ڕۆمی لەبەركردبوو كە تەنیشتەكانی تەسك بوون .

## خوف و نەعلەکەی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾

نەجاشی جوتێ خوفی ڕەشی تۆخی بە دیاری بۆناردو ئەویش لە پێی کـــرد[٦٩] هـــەروەها (دِح [illegible] [٧٠] [illegible] لەکـــەی: دوو(قبـــال)ی

---

(٦٩)عن عبدالله بن بُرَيدة ع [illegible] نبيّ ﴿ﷺ﴾ خُفَّين أسْوَدَين سَاذَجينِ فَلَبِسَهما، ثم توضأ ومَسَ [illegible] (٢٨٢١) وقال :(حديث حسن إنما نعرفه من حديث دلهم) و ابن ماجه و [illegible] د ذكرته من أجله في:(صحيح أبى داود)(١٤٤)

واتە: ئەصحەمەی [نەجاش [illegible] اڵی (٦)ی کۆچی موسڵمان بـووەو سـاڵی(٩)ی کۆچـی وەفـاتی کـردووە، پیعەمبـەر ﴿ﷺ﴾ بـەعمروی کـوڕی أمیـة الضمریدا نامەی بۆ ناردو بانگی کرد بۆ ئیسلام وموسڵمان بوو ] جوتێ خوفی ڕەشی سادەی تۆخی بەدیاری نارد بۆ پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾، ئەویش لەپێی کردن و پاشان دەست نوێژی شت و مەسحی لەسەرکرد . [ئەمەش بەڵگەیە لەسەر وەرگرتنی دیاری ئەهلی

کیتاب و بەڵگەشە لەسەر ئەوەی کە بنچینە لەشتەکاندا پاکێتی‌یەو هەروەها دروستێتی مەسح کردن دەردەخات] .

(٧٠) **عن أبى إسحاق عن الشعبي قال: قال المغيرة بن شعبة: (أهدى دِحية للنبى ﷺ خُفَّين فَلَبِسُهما). وقال جابر بن عامر( وَجُبَّةً فَلَبِسَهُما حتى تَخَّرقا، لا يدري النبي ﷺ أذَكيٌّ هما أم لا).** أخرجه الترمذي (١٧٦٦) وقال :حديث حسن غريب ،قال الالباني : هومن طريق ابن اسحاق– وهو الشيباني : سليمان –صحيح . وعن جابر وهو الجعفي ضعيف.ومن طريقه أخرجة أبوالشيخ ص ١٠٥).

**واتە: دیحیە [کە دیحیە کوڕی خەلیفە الكلبی‌یە هاوەڵێکی بەرێزەو هەندێك جار جبریل لەسەر شێوەی ئەم ئەهاتە خوار] جوتێ خوفی بەدیاری نارد بۆ پێغەمبەر ﷺ ئەویش لەپێی کردن (تائێرەی فەرموودەکە صەحیحەو ئەمەی دوایی ضەعیفە: جابری کوڕی عامردەفەرموێ: وە جبەیەکی بۆ پێغەمبەر ﷺ ناردو لە بەری کردن تا ڕزین، پێغەمبەر ﷺ نەیدەزانی کە ئایا پاکن یان نا) ، [واتە پێستەی سەربراوە یان مردارەوە بوو. خۆش کراوە یان نا، ئەمەش بەڵگەی ئەوەی تیایە کە بنچینە لە شتە نادیارەکاندا پاکێتی‌یە ] .**

**هەبوو[ (قبال) پارچە قەیتانێکە دەچێتە نێوان پەنجە گەورەو ئەوەی پەنای] (٧١) مووی پێوە نەبووەو لە پێستە دروست کرابوو(٧٢) وە دەیفەرموو: بە یەك تاکەوە مەڕۆن بەڕێدا(٧٣) وە لە کاتی لەپێ کردنی‌دا ڕاست پێش بخەن و بۆ داکەندنیش چەپ(٧٤)**

---

(٧١) **عن قتادة قال: (قلت لأنس بن مالك: كيف كان نعل رسول الله ﷺ؟ قال: لهما قبالان/.** أخرجه الترمذي (١٧٧٣) وأبوداود (١٤٣٣)ومسلم والنسائى والبخارى .

**واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالکم پرسی: شێوەی نەعلەکەی پێغەمبەر ﷺ چۆن بوو؟ ئەویش فەرمووی :دوو قەیتانی پێوە بوو [دەچووە بەینی پەنجەکانی ].**

(٧٢) **عيسى بن طَهمان قال: (أخرج إلينا أنس بن مالك نعلين جَرْداوَين ، لهما قِبالان قال : فحدثني ثابت– بَعدُ – عن أنس. أنهما كانتا نعلي النبي ﷺ).** و هوعند البخارى في صحيحه أول (الخُمس ) من طريق اخرى عن عيسى بن طهمان. اخرجه ابن ماجه (٣٦١٤)وقال الالبانى : اسناده صحيح على شرط الشيخين. عن ابن عباس بلفظ: **(كان لنعل رسول الله ﷺ قِبالان مَثنيٌّ شِراكهما).**

واته:عیسای کوڕی طەهمان دەفەرموێ: ئەنەسی کوڕی مالك دوونەعلی بۆ دەرهێناین کە مووی پێوە نەبوو دوو قەیتانی هەبوو. دەفەرموێ: ثابت دوای ئەمە بۆی باس کردم لە ئەنەسەوە کەوا: ئەوە دوونەعلەکەی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ بوو. [بەم جۆرە نەعلانە دەوترێت – السَبتیّة– ].

(٧٣)**عن أبی هريرة أن رسول الله ﴿ﷺ﴾ قال: ((لا يَمشيَنَّ أحدُكم في نعلٍ واحدةٍ، لَينعَلهُما جميعاً. أولِيُحفهما جميعاً)).** اخرجه البخاري و مسلم وأبوداود والترمذي (١٧٧٥) وصححه ابن ماجه وغيرهم .

واتە: هیچ کام لەئێوە بەیەك تاك نەعلەوە نەڕوات بەڕێدا . یان هەردووکی لەپێ بکات . یان هەردووکی دابکەنێت .

(٧٤) **عن أبی هريرة أن النبي ﴿ﷺ﴾ قال: ((إذا انتَعَلَ أحدُكم فَلْيَبْدأْ بِاليمين. وإذا نَـزَعَ فليبدأْ بالشِمال. فلتكن أوّلَهما تُنْعَل، وآخرَهما تُنزع)).** أخرجه البخاري ومسلم وأبوداود (٤١٣٩) وابن ماجه بنحوه(٣٦١٦)والترمذی (١٧٨٠) وقال: حديث حسن صحيح، و رواه أحمد .

واتە: ئەگەر یەکێك لە ئێوە نەعلی لەپێ کرد با بە ڕاست دەست پێ بکات و لە پێشدا لای ڕاست لە پێ بکات. وە ئەگەر دایکەند با بەچەپ دەست پێ بکات، وە با یەکەمیان کە لای ڕاستە لە داکەندنیدا بخرێتە دووەم دانەوە .

## شێوەی مستیلەکەی

مستیلەکەی لەزیوو دروست کرابوو، سەرو نەخشەکەی حەبەشی بوو لە موورووییەکی سپیو ڕەش پێك هاتبوو(٧٥). وەمۆری نامەکانی پێدەکرد(٧٦).

---

(٧٥) **عن أنس بن مالك قال: (كان خاتمُ النبي ﴿ﷺ﴾ من وَرِقٍ وكـان فُصُّـة حَبَشِـيًّا)** رواه البخاري بلفظ **(اتخذ خاتماً من فضة).** ومسلم (٢٠٩٤) وابن ماجه وأبوداود وغيرهم .

واتە: مستیلەکەی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ لەزیو دروست کرابوو وە سەرونەخشەکەی [شوێنی نەخش و هەڵکۆڵینەکەی ] حەبەشی بوو[ واتە کانزاکەی هی وولاتی حەبەشە بوو لە مورووییەکی تێکەڵ لە سپیو ڕەش دروست کرابوو، یان مەعدەنی مورووەکە حەبەشی بووە].

**وعن أنس بن مالك قال: (كان خاتم النبي ﴿ﷺ﴾ من فضة، فصُّه منـه).**أخرجـه البخـاري و أبـو داود(٤٢١٧) والترمذي (١٧٤٠) وصححه .وأحمد وابن سعد وأبن الشيخ .وهوصحيح .

**واته: مستيلەكەی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ لەزيوودروست كرابوو .شوێنە نەخشـەكەی هـەر لـە خـۆی (لـەزيوو) بـوو [ئـامرازی (منـه) لـە فەرموودەكـەدا دەگەڕێتـەوە بۆمسـتيلەكەو بـۆ (تـەبعـيض)ە واتـە: شـوێنی نەخشـەكەی هەنـدێك بـوو لـە مسـتيلەكە. وە لـەوە دەچـێ مستيلەكە چوارگۆشـە بووبـێ كـە ئەمـە نزيكترو ئاسانترە بـۆ هـەڵكۆڵين لەسـەری. منـيش دەڵێم ( كە بريتیيە لە شێخی ألبانی): ئەم فەرمودەيە ڕواڵەتەكەی پێچەوانەی فەرمودەی پێشووە كە فەرمووی: (شوێنی نەخشەكەی حەبەشیبووە). بۆيـە الحـافظ وەڵامـی ئـەوەی داوەتـەوە بـەوەی ئـەگونجێ پێغەمبـەری خـوا﴿ﷺ﴾چـەند مستيلەيەكی هـەبووبێ وە يـەك دانە نەبووبن، يان لەوانەيە ڕەنگەكەی حەبەشی بووبێ .والله أعلم ].**

**(٧٦) عن ابن عمر: (أن النبي ﴿ﷺ﴾ اتخذ خاتماً مـن فِضـة، فكـان يختِم بـه ولايلبسـه)**
قال الالبانى :قلت اسناده صحيح علىشرط الشيخين .أخرجه أحمد ٦٨/٢ وأبوالشيخ بأتم منـه دون قولـه (ولايلبسـه) بل هذا القدر منه شاذ عندي لأن الحديث في الصحيحين وغيرهما من طرق أُخرى عن نافع عن ابن عمر.فالحديث صحيح.

**واته: پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ مستيلەيەكی لـە زيـو دروسـت كـرد. مـۆری پـێ دەكـرد ( تـائێرەی فەرموودەكە صەحيحەو ئەمەی تری شازە: وە لە دەستی نەدەكرد!!!).**

**چونكە لەسەر نەخشەكەی نوسرابوو (محمـد رسـول الله)[٧٧] .ئـەم مسـتيلەيە لەدەستیدا بوو تا وەفاتی كرد ، دوای خۆی لـە دەسـتی ئـەبو بـەكرو عومـەرو عثمان دا بوو**(ڕەزای خوايان لێ بێت)، **تا ئەوە بوو لە سەردەمی عوثماندا**(ڕەزای خوای لێ بێت)، **كەوتە ناوبيری (ئەريس)ەوە كە بيرێكە لە باخێكی نزيك مزگەوتی (قوباء)[٧٨]**

---

**(٧٧) عن انس بن مالك قال: (كان نقش خاتم رسـول الله ﴿ﷺ﴾(محمد)سـطر، و(رسـول) سطر. و(الله) سطر).** وفيطريق أُخرى عنه: **أن الـنبي ﴿ﷺ﴾ (أراد أن ي/٨٥) كتـبَ إلى كسـرى وقيصر والنجاشي، فقيل له: إنهم لايَقبلون كتاباً إلابخاتم، فصاغ رسول الله ﴿ﷺ﴾ خاتماً حَلَقَتُـه فضة، ونَقَش فيه محمد رسول الله، (فكأنى أنظرإلى بياضه في كفه)**أخرجه الترمذي (١٧٤٧) والبخـارى ومسلم(٢٠٩٢) عن أنس قال: **(اتخذ رسول الله﴿ﷺ﴾ خاتماً من فضه ونقـش فيـه محمـد رسـول الله)** وأبوداود والنسائى. وهوصحيح. ومن الطريق الاخرى البخارى ومسلم (٢٠٧٢) وأبوداود وأحمد وابن سعد و أبو الشيخ .

واتە: نەقشی نوسراوی سەر مستیلەکەی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بریتی بوو لە (محمد) لە دێڕێکداو (رسول) لە دێڕێکداو(الله) لە دێڕێکی تریدا. لە ڕیواتەکەیتردا: پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ویستی نامە بنێرێت بۆ کیسراو قەیصەرو نەجاشی. پێ یان فەرموو: ئەوان عادەتیان وایە هیچ نامەیەك وەرناگرن بەبێ مۆر . ئەویش ﴿ﷺ﴾ مستیلەیەکی سازکرد کە ئەڵقەکەی لە زیو بوو، تیایدا هەڵکۆڵیبوو: (محمد رسول الله) . وەکو ئەوە وایە ئێستا سپێتیەکەی ببینم کە لە لەپی دەستیدا دەدرەوشایەوە .

**(٧٨) عن ابن عمر قال: (اتخذ رسولُ الله ﴿ﷺ﴾ خاتماً من وَرِقٍ، فكان في يده، ثم كان في يدِ أبى بكر ويد عمر، ثم كان في يد عثمان حتى وقع في بئر أريس، نقشه: :محمد رسول الله).**أخرجه البخاري (٥٤) والنسائى وابوداود (٤٢١٨) والترمذي (١٧٤١)وليس في حديث الترمذي والنسائي: **(ثم كان في يد أبي بكر...)** بل هو عندهما حديث آخر. ورواه مسلم . الارواء (٨١٨) .

واتە: پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ مستیلەیەکی دروست کرد لە زیو لە دەستی دەکرد پاشان لەدوای خۆی لەدەستی أبو بکرودواتر لە دەستی عومەردا بوو، ئینجا عثمان لە دەستی کرد تا ئەو مستیلەیە کەوتە ناوبیری ئەریس [کەووشەی(ئەریس)ئەگەڕێتەوە بۆ ناوی پیاوێکی جولەکە، بەزمانی ئەهلی شام واتە رزگاربوو– الفلاح ] نەقشەکەی بریتی بوو لە (محمد رسول الله) .

به زۆری لە دەستی ڕاستی دەکرد ، [٧٩] هەندێ جاریش لە دەستی چەپی دەنا[٨٠]

---

**تێبینی / عن أنس: (أن النبي ﴿ﷺ﴾ كان إذا دخل الخلاء نزع خاتمه)**رواه الترمذى (١٧٤٦) وابوداود (١٩) وغيرهم، قال الالبانى :وقال ابو داود (حديث منكر) ولقد صدق . وإن صححه المؤلف(أي الترمذي) وغيره كماهومقرر في كتب التخريج . وبينته في الإرواء (٤٨) و ضعيف أبى داود (٤) .

واتە: پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ کە دەچووە سەر ئاو(بۆدەست بە ئاوگەیاندن) مستیلەکەی دادەکەند .

بەڵام ئەم فەرمودەیە وەك بینیت ضەعیفەو بە پێچەوانەشەوە دەقی تر هاتووە : **روى ابن سعد (٤٧٥/١) بسند صحيح أن الحسن البصري سئل عن الرجل يكون في خاتمه اسم من اسماء الله فيدخل به الخلاء ؟ فقال : أو لم يكن في خاتم رسول الله ﴿ﷺ﴾ آية من كتاب الله؟ يعني (محمد رسول الله) .**

واتە: پرسیار کرا لە حەسەنی بەصری – ڕەحمەتی خوای لیٚ بیٚت– [کە لە گەورە تابعی یەکانــە] دەربــارەی پیاویٚــك کــە مســتیلەیەکی لــە دەســت دایــە ناویٚــك لــەناوەکانی خوایگـەورەی تیٚدا بیٚـت و پیٚـوەی بچیٚتە سـەرئاو؟ ئـەویش فـەرموی: ئایـا مسـتیلەکەی پیٚغەمبەر﴿ﷺ﴾ ئایەتیٚکی لە قورئان لەسەر نەنوسرابوو؟ واتە(محمد رسول الله).

(٧٩)**عن علي بن أبي طالب: (أن النبي ﴿ﷺ﴾ كان يلبس خاتمه في يمينه)** اخرجه ابو داود (٤٢٢٦) والنسائي .قال الالباني : واسناده صحيح على شرط الشيخين .وهو مخرج في إرواء الغليل (٨٢٠).

واتە: پیٚغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ مستیلەکەی دەکردە دەستی ڕاستی .

(٨٠) **عن جعفر بن محمد عن أبيه قال: (كان الحسنُ والحسين يَتَخَتَّمان في يَسارهما).**أخرجه الترمذي (١٧٤٣) وعن ابن عمر عند أبى داود (٤٢٢٧): **(أن النبي ﴿ﷺ﴾ كان يختم في يساره. وكان فصه في باطن كفه)** وهو شاذ لمخالفته رواية الثقات .وقد صحَّ ذلك عن ابن عمر موقوفاً عليه .

واتە: حەسەن و حوسەین (ڕەزای خوایان لیٚ بیٚت) مستیلەیان دەکردە دەستی چەپیان. لـە ڕیوایەتەکـەی تـردا [هـەر چـەند ئـەم ریوایەتـە–ئـەلبانی دەفـەرمویٚ: شـازە بـەڵکو بـە مەوقوف هاتووە کە ابن عمر خۆی لـە دەستی چەپی کردووە ]: پیٚغەمبـەری خـوا﴿ﷺ﴾ مستیلەکەی لە دەستی چەپی دەکردو سەرو مۆرەکەی لە ناو لەپی دەستی دەنا.

تیٚبینـی / دیـارە ئـەمانیش لەمـەدا ئیقتیـدایان کـردوە بـە پیٚغەمبـەرەوە﴿ﷺ﴾، چونکە هەندیٚ جار لە دەستیچەپی کردووە. وە هیچ بەڵگەیەکی صەحیح نیٚیە لەسەر ئەوەی لە چەپ کردن نەسخی یەکەم بکاتەوەو هەردوو شیٚوازەکەش دروستە .

بەم شیٚوەیە: نەخشەکەی دەخستە ناولەپی دەستی، وەنەهی کردوە لەوەی کەس نەخش بکاتە مستیلەکەی[٨١] .وە سەرەتا مستیلەیەکی ئاڵتونی هەبوو دوایی لایبردو ئەم دانەیەی کردە دەستی کە لە زیوو دروست کرا بوو[٨٢].

---

(٨١)**عن ابن عمر: (أن النبي ﴿ﷺ﴾ اتخذ خاتماً من فضة، وجعل فِصَّه مما يلي كفَّه، ونقش فيه: محمد رسول الله، ونهى أن يَنقش أحدٌ عليه، وهو الذي سقط من مُعَيقيب في بئر أريس).**
أخرجه البخارى ومسلم (٢٠٩١)وأبوداود (٤٢١٨) وغيرهم ...

واتە: پیٚغەمبەر ﴿ﷺ﴾ مستیلەیەکی دروست کرد لە زیوو . سەرونەخشـەکەی لـە لـەپی دەسـتی دەنـاو تیایـدا هەڵکۆڵیبوو:(محمـد رسـول الله)، وە نـەهی کـردووە لـەوەی کـەس نـەخشـی تیٚدا هـەڵبکۆڵیٚت . ئـەوە ئـەو مستیلەیە بـوو کـە موعـەیقیب لیٚــی کەوتــە نــاو بــیری (ئەریســە)وە [ موعــەیقیب بەرپرســی مســتیلەکەی

پێغەمبەر﴿ﷺ﴾بوو، هەر زوو موسڵمان بووەو بەشداری بەدری کردووەو کۆچیشی کـردوە بـەرەو حەبەشـە .ابوبکروعومـەرو عـوثمـانـیش (ڕەزای خوایـان لێ بێـت) کردبویانە کاربەدەستی (بیت المال)] .

(٨٢) **عن ابن عمر قال: (اتَّخَذَ رسولُ الله ﴿ﷺ﴾ خاتماًمن ذهب، فكان يَلبَسه في يمينه، فاتَّخَذَ الناسُ خواتيمَ من ذهبٍ، فَطَرحَه ﴿ﷺ﴾ وقال: ((لاألبسه أبداً)) فطرح الناسُ خواتيمهم).** اخرجه البخاری و زاد في رواية : **(ثم اتخذ خاتماً من فضة فاتخذ الناس خواتيم الفضة).** و مسلم (٢٠٩١) وأبوداود (٤٢١٨) وغيرهم .

واتـە: پێغەمبـەری خـوا ﴿ﷺ﴾مسـتیلەیەکی لـە ئـاڵتون دروسـت کـردو لـە دەسـتی ڕاستی دەکرد. خـەڵکیش مسـتیلەی ئاڵتونیـان دروسـت کـردو لـە دەسـتیان دەکـرد. تاپێغەمبـەر ﴿ﷺ﴾ فـڕێی داو فـەرموی: هـەرگیز لـە دەسـتی ناکـەم. خەڵکەکـەش مستیلەکانیان فڕێ دا . [ئەمەش بەڵگەیە لەسەرحەرامێتی ئاڵتون بۆ پیاوان و نەسخ بوونـەوەی ئـەوەی یەکـەم جـار حـەڵاڵ بـووە. وەبەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی زۆربـەی جـار لەدەستی ڕاستی کردوە ].وە دوایی مستیلەیەکی لە زیوو دروست کرد، خەڵکەکەش مستیلەی زیویان لە دەست نا [کە ئەمەش لە دوای ئەوەی یەکەمەوەیە ].

## شێوەی شمشێرو زرێ پۆش و ژێرکڵاوی جەنگ (مغفر)ەکەی

دەسکی شمشێرەکەی لە زیو بوو[٨٣] پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾لە ڕۆژی(ئوحد)دا دوو زرێی لەبـەردا بـووە[٨٤] کـە بەسـەریەکدا لـە بـەری کـرد بـوون.[٨٥] وە ڕۆژی

---

(٨٣) **عن أنس قال: (كانت قَبيعةُ سيف رسول الله ﴿ﷺ﴾ من فِضَّةٍ).** اخرجـه الترمـذي (١٦٩١) وحسّـنه، وابـو داود (٢٥٨٣) والنسـائي،وقال الالبـانى: واسـناده صـحيح . انظـر الإرواء (٨٢٢) و(صـحيح أبـى داود) (٢٣٢٩).

واتە:دەسکی شمشێرەکەی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ لەزیوو دروست کرابوو .

(٨٤)**عن الزبير بن العوام قال: كان على النبي ﴿ﷺ﴾ يوم أُحُدٍ درعان، فَنَهَضَ إلى الصخرة فلم يَستطع، فاقعَدَ طلحة تحته، وصَعِد النبي ﴿ﷺ﴾ حتى استوى على الصخرةِ، قال: سمعت النبي ﴿ﷺ﴾ يقول: ((أوْجَبَ طلحَةُ)).** اخرجه الترمذي (١٦٩٢) و(٣٧٣٩) انظر (صحيح أبى داود) (٢٣٣٢)

واتــــه: پێغەمبـــەری خـــوا ﴿ﷺ﴾ لـــە ڕۆژی(ئوحـــد)دا دوو زرێی لەبـــەردا بـــوو [کە(زرێ)جبەیەکە لە ئاسن دروست کراوەو پێشی دەوترێ (الزرد) بە ئەڵقە دروست دەکرێت ولە پۆشاکی جەنگە]، هەستا بۆ سەر بەردێك نەیتوانی بچێتە سەری، بۆیە طەلحەی کوڕی [عبیدالله القرشی کە یەکێکە لە مژدە پێدراوەکانی بەهەشت و یەکێکە لەشەش هاوەڵی شوری. لە ساڵی (٣٦ )ی کۆچی لە ڕۆژی شەڕی (الجمل)دا کوژراو تەمەنی (٦٤)ساڵ بوو] دانیشت لە بەردەمیداو پێغەمبەریش ﴿ﷺ﴾ بەسەر پشتیدا سەرکەوت تاچووە سەر بەردەکەو دەفەرموێ: بیستم دەیفەرموو: بەهەشت واجب بوو بۆ طەلحەو بەهەشتی بۆ خۆی دەستەبەر کرد.

(٨٥)**عن الصائب یزید: (أن رسولَ الله ﴿ﷺ﴾ کـان علیـه یـوم أحُـدٍ دِرعـان قـد ظـاهر بینهما).**أخرجه ابوداود (٢٥٩٠) انظر (صحیح أبي داود) (٢٣٣٢) وهو حدیث حسن.

واتە: پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ لە ڕۆژی( ئوحد)دا دوو زرێی پۆشیبوو وە بەسەر یەکدا لە بەری کردبوون [کە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر گرنگی دان بە خۆ پاراستن لە جەنگدا بۆ زیاتر هەڵپەکردن و کەلێن نەدان بە دوژمن ].

فەتحی مەککە میغفەرێکی لەسەردا بوو لە ژێر قەلنسوەکەیەوە (واتە کڵاوە ئاسنەکەی) (٨٦)

---

(٨٦) **عن أنس بن مالك: أن النبي ﴿ﷺ﴾ دخل مكة (عام الفتح ١٠٦ )وعلیه مِغْفَر، فـ(لما نَزَعه) قیل له: هذا ابنُ خَطلٍ متعلق بأستار الکعبةِ . فقال:(( اقتلوه)).(قـال ابـن شهاب: وبلغنيأن رسول الله ﴿ﷺ﴾ لم یکن یومئذ مُحرِماً).** اخرجه البخاری ومسلم (١٣٥٧) و أبوداود وابن ماجه(٢٨٠٥) والترمذي. وهو حدیث صحیح .

واتــە: پێغەمبــەری خــوا﴿ﷺ﴾ لەســاڵی فەتحــدا هاتــە نــاو شــاری مەککــەوەو میغفەرێکی لەسەر دا بوو [کە پارچەیەکە کە دروست کراوە لە ئاسن و بە ئەندازەی سەر دروست دەکرێت و دەچنرێت بە شێوەی ئەڵقەو لە ژێر کڵاوی قەلنسوەکەوە

لەسەر دەکرێت]. کاتێ دایکەند پێیان فەرموو: ئەوە (ابن خَطَل)ە خۆی هەڵواسیوە بە پەردەکانی کەعبەدا. ئەویش فەرموی: بیکوژن [چونکە لە ئیسلام هەڵگەڕابوویەوەو موسڵمانێکی خزمەتکاری خۆی کوشتبوو]. ابن شهاب دەفەرموێ: وە پێم گەیشتووە کە ئەو ڕۆژە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ئیحرامی نەبەستبوو .

پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ لە ڕۆژی ... زەر(عەمامە)یەکی ڕەشی لە سەردا بوو[87] هەندێ جاریشر ... ێزەری ڕەشی لەسەر دەکردو لوێچکەی بەناو شانیدا بە... و بۆن و عەترەی لێ دەدا کە قژی پێبۆن خۆش دەکرد[89]

(٨٧) عن جابر قال: (دخل النبي ... ح وعليه عِمامةُ سوداءُ) أخرجه مسلم وأبوداود (٤٠٧٦) وا بن ماجه والترمذي (٣٥..) وغيرهم.

واتە: پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ لە ڕۆژی فەتحی مەککەدا کە هاتە ناو شاری مەککەوە مێزەرێکی ڕەشی لەسەر کردبوو .

(٨٨) **عن عمرو بن حريث: (أن النبي ﴿ﷺ﴾ خطب الناسَ و عليه عمامةٌ سوداء)** أخرجه الترمذي و ابن ماجه (٣٥٨٤) و زاد فيه: **(يخطب على المنبر)** وأبو داود (٤٠٧٧) ولفظه: **(رأيت النبي ﴿ﷺ﴾ على المنبر وعليه عمامة سوداء قد أرخى طرفها بين كتفيه)** وأخرجه مسلم (١٣٥٩) والنسائي .

واته: پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ لەسەر مینبەر ووتاری دەداو بینیم مێزەرێکی ڕەشی لەسەر کردبوو لوێچەکەی بەناو شانیدا بەردابوویەوە .

**وعن ابن عمر قال: (كان النبي ﴿ﷺ﴾ إذا اعتَمَّ سَدَلَ عِمامته بين كتفيه). قال نافع: وكان ابن عمر يفعل ذلك، قال عبيدالله: و رأيت القاسم بن محمد وسالماً يَفعلان ذلك)** اخرجه الترمذي(١٧٣٦) وهو مما تفرد به وقال:حسن غريب،قال الالباني:( وقدخرجته وذكرت له طرقاً وشواهد يتقوى بها في الصحيحة) (٧١٦) وهو حديث صحيح .

واته: پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ کە مێزەری لەسەر دەکرد لوێچکەی بەناو شانیدا بەر دەدایەوە .

نافع دەفەرموێ :ابن عمریش هەر وای دەکرد .عبیداللە دەفەرموێ : وەقاسمی کوڕی محمد و سالمیش بەهەمان شێوەیان دەکرد .

(٨٩) **عن ابن عباس: (النبي ﴿ﷺ﴾ خطب الناس و عليه عِمامةٌ دَسْماءُ)** رواه الترمذي وأصل هذاالحديث عند البخاري عن ابن عباس قال: **(خرج رسول الله وعليه ملحفة متعطفاً بها على منكبيه وعليه عصابة دسماء)** و زاد فيه فضل الانصار . ورواه أحمد (٢٣٣/١) مُختصراً مثل رواية الترمذي .

واته: پێغەمبەریخوا ﴿ﷺ﴾ووتاری دەداو مێزەرێکی لەسەردا بوو ڕەنگیعەتری قژی پێوە دیار بوو. لە ریوایەتەکەی تردا: پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ لەماڵ دەرچوو مل پێچێکی بەسەر شانەوە پێچابوو، وە مێزەرێکی لەسەردابوو شوێنەواری بۆن وعەتری قژی پێوە بوو .

## کراس دامێن ( إزار)ی پێغەمبەریخوا ﴿ﷺ﴾

پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ کە وەفاتی کرد کراسێکی پوواو و ڕزیو، لەگەڵ کراس دامێنێکی ئەستوری لەبەردا بوو[٩٠] وە پۆشاکەکەی تا ناوەڕاستی قاچی پیرۆزی دەهات[٩١] وە دەیفەرموو: پۆشاك مافی ذییە لە خوار قولەپێوە[٩٢]

---

(٩٠)**عن أبي بُرْدَةَ عن أبيه [أبوه هو أبوموسى الأشعرى الصحابى المشهور ] قال: (أخرجت إلينا عائشة(رضىالله عنها) كساءً مُلَبَّداً، وإزاراً غليظاً. فقالت: قُبِض روحُ رسول الله ﴿ﷺ﴾ في هذين)** أخرجه مسلم (٢٠٨٠) وأبوداود (٤٠٣٦) وابن ماجه واخرجه البخاري في اللباس والخمس .

واتە: عائیشە( ڕەزای خوای لێ بێت) پۆشاکێکی پورتوکاوو کراس دامێنێکی(إزار)[کە بریتییە لەو پۆشاکەی لە ناوقەد بەرەوخوار دادەپۆشێ] ئەستوری بۆ هێنایینە دەرەوەو فەرمووی: کە پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾وەفاتی کرد ئەم دووانەی لەبەردا بوو .

(٩١) **عن الاشعث بن سُليم قال: سمعت عمتي تُحَدّثُ عن عمها قال: (بينا أنا أمشي بالمدينة إذا انسان خلفي يقول: ((ارفع إزارك، فإنه أتقى)). فإذا هو رسول الله ﴿ﷺ﴾ فقلت: يارسول الله إنما هي بُردَةٌ مَلحاءُ، قال: ((أما لك فيّ أُسوةٌ)). فنظرت فإذا إزاره إلى نصفِ ساقيه).**أخرجه أحمد والبيهقي (الجامع الصغير) قال الالباني : واخرجه أبو الشيخ ص(١٠٨) مختصراً من الوجه المذ كور، وعمة الاشعث لاتُعرف، لكن للحديث شاهد يتقوى به من حديث الشريد بن سويد خرجته في (الصحيحة) (١٤٤١) .

**واته: ئەشعەثی کوڕی سولەیم دەفەرموێ: لە پورمم بیست [کە ناوی نەزانراوە] ئەویش لە مامی‌یەوە دەگێڕایەوە کەناوی عبیدی کوڕی خالد المحاربی‌یە کە فەرمویەتی: جارێکیان لە ناوشاری مەدینەدا دەڕۆیشتم بەڕێدا یەکێك لە دوامەوە فەرموی: کراس دامێنەکەت بەرز بکەرەوەو هەڵی بکە چونکە ئەوە پاك ترە لە پیسی. کەئاوڕم دایەوە بینیم پێغەمبەری خوایە ﴿ﷺ﴾ منیش ووتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾خۆ ئەمە پۆشاکێکە خەتی ڕەش و سپی تێدایە .فەرموی : ئایامن سەرمەشق و پێشەنگ نیم بۆت. کە تەماشام کرد خۆی کراس دامێنەکەی تا ناوەڕاستی قاچەکانی بوو .**

(٩٢)**عن حذيفة بن اليمان قال: (أخذ رسول الله ﴿ﷺ﴾ بعضلة ساقي أوساقهِ ، فقال :((هذا موضع الإزار ، فإن أبيت فأسفلُ ، فإن أبيت فلا حق للإزار في الكعبين))**اخرجه الترمذي (١٧٨٤) وابن ماجه (٣٥٧٢) والنسائي والطيالسي . قال الالباني و اسناده صحيح لغيره (الصحيحة) (٢٣٦٦)

**واتە: حوزەیفە دەفەرموێت: پێغەمبەری‌خوا ﴿ﷺ﴾ئێسقانی خوار ئەژنۆی قاچی من یان قاچی خۆی گرت و فەرموی: ئەمە شوێنی کراس دامێنە. ئەگەر نا خوارتر، ئەگەر نا ئەوا پۆشاك مافی نی‌یە قولەپێ‌یەکان داپۆشی .**

## دانیشتن و شان دادانی ﴿ﷺ﴾

**پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ هەندێ جار لە مزگەوتدا بە پشتدا ڕادەکشاو قاچی دەخستە سەر یەك[٩٣] وە هەندێ جار کە لە مەجلیس یان مزگەوتدا دادەنیشت پشت و هەردوو قاچەکانی بە دەستی کۆدەکردەوە بە شێوەی (إحتباء)[٩٤] هەندێ جاریش شانی دادەدایە سەر پشتی‌یەك لەلای**

---

(٩٣)**عن عباد بن تميم عن عمه: (أنه رأى النبي ﴿ﷺ﴾ مستلقياً في المسجد ، واضعاً إحدى رِجليه على الاخرى).** أخرجه البخاری ومسلم (٢١٠٠) وأبوداود و النسائی وغيرهم.

واتە: عبادی کوڕی تەمیم لە مامی‌یەوە دەگێڕێتەوە [کە ناوی عبدالله ی کوڕی زەیدی کوڕی عاصمی کوڕی محمدی هاوەڵی بەناوبانگە. دەڵێن ئەو کەسەیە کە موسەیلەمەی درۆزنی کوشت] کە پێغەمبەری ﴿ﷺ﴾ بینیوە لەمزگەوتدا ڕاکشاوەوقاچێکی خستۆتە سەر قاچەکەی تری.

(٩٤)**عن أبى سعيد الخدرى قال: (كان رسولُ الله ﴿ﷺ﴾ إذا جلس في المسجد (في نسخة: في المجلس) احتَبى بيديه).** اخرجه البيهقى وأبو داود (٤٨٤٦) قال الألباني واسناده ضعيف جداً لكن له شواهد كثيرة تدل على أن له أصلاً أصيلاً بعضها في مسلم وقد خرجتها والحديث في (الصحيحة) (٨٢٧)

واتە: پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ ئەگەر لە مزگەوت یان مەجلیسدا دابنیشتایە بە هەردوو دەستی پشت و هەردوو قاچەکانی کۆدەکردەوە [کە ئەم شێوە دانیشتنە جێی پاڵ دانەوە دەگرێتەوە بە دیوارێکەوە] .

چەپی‌یەوە[٩٥] وە بە ڕاکشاوی‌یەوە هەرگیز خواردنی نەخواردوە [٩٦]

---

(٩٥) **عن جابر بن سمرة قال: (رأيتُ رسول الله ﴿ﷺ﴾ متكئاً على وسادة على يساره).** أخرجه الترمذي (٢٧٧١) وأبوداود (٣١٤٣) وحسنه الترمذي وهو على شرط مسلم . واخرجه غيرهم . وهو عند مسلم (١٦٩٢) وفيه قصة..

واتە: پێغەمبەری خوام ﴿ﷺ﴾ بینی شانی دادابوو لەسەر پشتی‌یەك لەلای چەپی‌یەوە .

**وعن عبد الرحمن بن أبي بكرة عن [أبيه وهو أبو بكرة نُفَيع بن الحارث صحابي مشهور بكنيته نزل من الطائف من بكرة تعلق بها فكناه النبي ﴿ﷺ﴾ بأبي بكـرة وكـان مثـل النصل من العبادة ] قال: قال رسول الله ﴿ﷺ﴾:((ألا أُحَدِّثكم (في نسخة:أُخبركم)بأكبر الكبائر))؟ قالوا: بلى يارسول الله،قال: (الإشراك بالله ، وعقوق الوالدين)) قال: وجلـس رسول الله ﴿ﷺ﴾ وكان متكئاً قال: ((وشهادةُ الزّور أو قولُ الزور)). قال: فما زال رسول الله ﴿ﷺ﴾ يقولها حتى قلنا: ليته سكت).**أخرجه البخاري ومسلم و الترمذي (١٩٠٢) .

واته: ئايا هەواڵتان بدەمێ گەورەترینی گوناهە گەورەکان کامانـەن؟ وتیـان: بـەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾، فـەرمووی: هاوبـەش بڕیـاردان بۆ خـوا، وە ئـازاردانی دایـك و بـاوك. دەفـەرمویٚ: پێغەمبـەریخوا﴿ﷺ﴾ ڕاکشـابوو هەسـتا دانیشـت و فـەمووی: وە شـایەتی درۆ یـان قسـەی درۆ. ئەفـەرمویٚ: بـەردەوام پێغەمبـەری خـوا ﴿ﷺ﴾ ئەم دووانەی دووبارە دەکردەوە هەتا ووتمان: خۆزگە بێدەنگ دەبوو .

(٩٦)**عن أبي جحيفة قال: قال رسول الله ﴿ﷺ﴾:((أما أنا فلا آكل متكئاً، (لا آكـل متكئاً/١٢٥))** أخرجه البخاري وابوداود(٣٧٦٩) والترمذي(١٨٣١) وقال: حديث حسن صحيح. انظر الإرواء (١٩٦٦)

واته: من هەرگیز بەڕاکشانەوە خواردن ناخۆم .

## <u>شێوازی خواردنی</u> ﴿ﷺ﴾

پێغەمبـەری خـوا﴿ﷺ﴾بـە هەرسـێ پەنجـەی (گـەورەو شـایەتمان و ناوەڕاسـت)خواردنی دەخـواردو دوایـی پـێش ئـەوەی دەسـتی بسـڕێت دەیلێسانەوە[٩٧] هەندێ جار ئەوەندە برسی دەبوو نەیدەتوانی دابنیشێ بە تەواوی‌و بەپاڵدانەوە بەشتێکەوە خواردنی دەخوارد[٩٨]. وە هـەرگیز خێزان وکـەس وکـاری پێغەمبـەر﴿ﷺ﴾ دوو ڕۆژ لەسـەر یـەك تێریـان نـەخواردوە لـە نانیگەنم و جۆ تا وەفاتی کرد[٩٩]

(٩٧) **عن ابن كعب بن مالك عن أبيه قال: (كان رسول الله ﴿ﷺ﴾ يأكـل بأصـابعه الـثلاث وَيلَعقُهن).**أخرجه الترمذي وأحمد ومسلم (٢٠٣٢) ولفظه عن كعب: **(رأيت النبي ﴿ﷺ﴾ يلعق أصابعه الثلاث من الطعام)** وفي رواية لمسلم: **(ويلعق يده قبل أن يمسحها)** وأبوداود (٣٨٤٨).

واتـه: پێغەمبـەری خـوا ﴿ﷺ﴾ بەهەرسـێ پەنجـەی (گەورەوشـایەتمان وناوەڕاسـت) خواردنی دەخواردو پێش ئەوەی دەستی بسڕێت دەیلێسانەوە .

(٩٨)**أنس بن مالك يقول: (أُتى رسول الله ﴿ﷺ﴾ بتمر، فرأيته يأكل وهو مُقْعٍ من الجـوع).**
اخرجه مسلم (٢٠٤٤) وأبوداود (٣٧٧١) والنسائي و الترمذي .

واته: خورمایان هێنا بۆ پێغەمبەریخوا﴿ﷺ﴾ بينيم لە برسـاندا نەيدەتوانی دانيشـێو پشتی دابووەو دەيخوارد .[(الاقعاء): واتە پشت دانەوە، مەبەست پێی لێرەدا ئەوەيە كە لەسەر سمتی دابنيشێو هەردوو قاچی بەلاوازیيەوە بنێتە سەر زەوی. بڕوانە (النهاية)].

(٩٩) **عائشة أنها قالت: (ماشبع آلُ محمدٍ ﴿ﷺ﴾من خُبزِ الشعير يومين مَتتابعين حتى قُبِضَ رسول الله ﴿ﷺ﴾)** أخرجه الترمذي (٢٣٥٨) ومسلم (٢٩٧٠) وابن ماجه و قـال الترمـذى :حسـن صـحيح . ورواه البخارى بلفظ: **(.... من طعام البر ثلاث ليال تباعاً....)**

واته: خێزان و كەس و كاری محمد ﴿ﷺ﴾ دوو ڕۆژ لەسەر يەك تێريان نەخوارد لەنانی جۆ هەتا وەفاتی كرد . لەڕيوايەتەكەی تردا : لەنانی گەنم سێ ڕۆژ لەسـەر يـەك تێريـان نەخوارد .

**أبا اُمامة الباهلي يقول: (ماكان يَفْضُلَ عن أهل بيت رسول الله ﴿ﷺ﴾ خبز الشـعير).**أخرجـه الترمذي (٢٣٦٠) وقال : حديث حسن صحيح . ورواه أحمد وابن سعد ٤٠١/١ .

واتـە: هـەرگيز نـانی جـۆ لەخانـەوادەو كـەس و كـاری پێغەمبـەری خـوا ﴿ﷺ﴾ زيـاد نەدەبوو وە نەدەمايەوە .

وە زۆربـەی نانيـان نـانی جـۆ بـووەو زۆر ئێـوارەش بـەبێ شـێو سـەريان دەنايـەوە[(١٠٠)] وەپێغەمبـەریخوا ﴿ﷺ﴾ لەسـەرمێز نـانی نـەخواردوە، بـەڵكو لەسـەر زەوی دادەنيشـت و لەبەردەمی‌دا هـەرگيز زەلاّتـەو ووردە شـتی لـەم بابەتە نەبووە كە ئارەزووی مرۆڤ زياد دەكات بۆ خواردن[(١٠١)]

---

(١٠٠) **عن ابن عباس قال: (كان رسول الله ﴿ﷺ﴾ يبيتُ الليالى المتتابعةَ طاوياً هـو وأهلُـه لايجدون عَشاءً، وكان أكثر خبزهم خبز الشعير).**اخرجه الترمذي(٢٣٦١) وقال : حسن صـحيح ،وابـن ماجـه وابن سعد ٤٠٠/١ وهو مخرج في الصحيحة (٢١١٩) .

واتــه: جــاری وا دەبــوو چــەندان شــەو ڕادەبــوورد بەســەر پێغەمبــەری خــوا(ﷺ)و خێزانەکانیداو شێویان نەبووە تا بیخۆن، وە زۆربەی نانیشیان نانی جۆ بوو .

**أبوحازم عن سهل بن سعد أنه قيل له: (أكَلَ رسول الله (ﷺ) النَقيَّ يعنى الحُوّاري؟ فقـال سهل: مارأى رسول الله (ﷺ) النّقيَّ حتى لَقي الله عزوجل، فقيل له: هل كانت لكم مناخل على عَهدِ رسول الله (ﷺ)؟ قال : ماكانت لنا مناخل. قيل: كيف كنتم تصنعون بالشعير؟ قـال: كنـا ننفخه فيطير منه ماطار (ثم نُثَرّيه) ثم نَعْجِنُه).**أخرجه الترمذي (٢٣٦٥)و قـال: حـديث حسـن صـحيح. وفاتـه البخاري وابن ماجه(٣٣٧٥)و أحمد وابن سعد .

واتە: پرسیاریان لە سەهلی کوڕی سەعد کرد: ئایا پێغەمبەری خوا(ﷺ) نانی ئاردی ووردو سپی خــواردووە ؟ ســەهلیش فــەرمووی: پێغەمبــەری خــوا(ﷺ) تــا گەیشــت بــە خــوای پــەروەردگارو وەفــاتیکرد بەچــاوی خــۆی ئــاردی ووردی نــەبینی. وتیــان: ئایــا لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) هێڵەکتان هەبوو؟ فەرموی: نەخێر هێڵـەکمان نـەبوو. ووتیان: ئـەی چیتان دەکرد لـە جۆ. فەرموی: دوای کوتین و هاڕینی فوومـان لـێ دەکرد ئەوەی لێی ڕۆی دەڕۆیشت پاشان ئاومـان دەکرد بەسـەریداو دەمانشێلاو دەمـانکرد بـە هەویر .

(١٠١) **عن انس بن مالك قال: (ماأكل نبيُّ الله (ﷺ) على خِوانٍ ولا في سُكُرُّجَةٍ ، ولا خُبِزَ له مُرَقّقٌ).قال: فقلت لقتادة: فعلام كانوا يأكلون ؟ قال:على هذه السُّفَرِ)** أخرجـه الترمـذي (٣٣٦٤) وقال:حديث حسن صحيح، والبخاری وابن ماجه والنسائي.

واتــە: پێغەمبــەری خــوا(ﷺ) هــەرگیز لەســەر مێــزو تەپڵــەك نــانی نــەخواردوەو لــە (سُکُرُّجَەَ)شـدا نـەیخواردوە [کـە دەفرێکـی بچوکە شـتێکی کـەمی تـێ دەکرێـت بـۆ زیـادە ئارەزووی خواردن کردنەوەو(إشتهاء) وەکو زەلاتەو ترشیات و..] وە ئاردی سپی و وردی بـۆ نـەکراوە بـەنان. دەفـەرموێت: لـە قـەتادەم پرسـی: ئـەی لەسـەرچی نانیـان دەخـوارد؟ فەرمووی : لەسەر ئەم سفرەی خواردنانە[سفرەش ئەوەیە کە دادەخرێت لـە زەویـدا ئیتر لە پێستە دروست بکرێت یان پۆشاك و پەڕۆ ] .

گۆشـتی مریشـکی خـواردووە،(١٠٢) فەرموویـەتی: زەیـت لـە دارێکـی پـیرۆزە (١٠٣) وە لە مزگەوتدا خـواردنی خـواردووە (١٠٤) وە ئـەم شـتانەی بـەلاوە خـۆش بووەو حەزی لێ کردووە : سرکە(خەل)(١٠٥)

---

(١٠٢) **عن زَهْدَم الجَرمي قال: كنا عند أبى موسى الأشعري فاتي بلحم دجاج، فَتَنَحى رجلٌ من القوم، فقال: مالَكَ؟ فقال: إنى رأيتها تأكل شيئاً فحلفتُ أن لا آكلَها، قال: (أدنُ فإنى رأيت رسول الله (ﷺ) يأكل لَحم الدجاج).** وفي رواية عنه قال: **(كنا عند أبى موسـى الاشـعرى، قـال:**

**فَقُدّمَ طعامه، وقُدّم في طعامه لحمُ دجاج، وفي القوم رجل من بني تيْمِ الله، أحمرُ كأنَّه مولى. قال: فلم يَدنُ.فقال له أبوموسى:(ادنُ فإني قد رأيت رسول الله ﷺ أكل منه)، فقال: إني رأيته يأكل شيئاً فقذِرته، فحلفت أن لا أطعَمه أبداً)**أخرجه البخارى ومسلم والترمذي (١٨٢٧) وقال : حديث حسن صحيح .

واته: ئێمه لەخزمەت أبوموسادا بووین خواردنیان بۆ هێناو گۆشتی مریشكی تیابوو. لە ناو مەجلیسەكەدا كابرایەكی سووركاری تێدا بووكە لە نەوەی (تَیمِ الله)بوو لەخزمەتكار دەچوو كشایە دوواوە (یان نەهاتە پێشەوە). ئەبووموسا پێی فەرموو: نزیك بەرەوە من بینیومە پێغەمبەر ﷺ لە گۆشتی مریشكی خواردووە. ئەویش ووتی: من بینیم كە شتێكی پیسی خواردو قێزم لێ كردەوە، بۆیە سوێندم خواردووە كە هەرگیز نەیخۆم .

(١٠٣)**عن أبى أسيدٍ قال: قال رسول الله ﷺ:((كلوا الزيتَ. وادَّهنوا به، فإنه من شجرةٍ مباركة)).** أخرجه الترمذي (١٨٥٣) واستغربه لكن حسنه الالبانى كما في الصحيحة (٣٧٩) وله طريق اُخرى فيه .

واته: زەیتی زەیتون بخۆن و سەروڕیشی خۆتانی پێ چەور بكەن چونكە لە دارێكی پیرۆزە .

(١٠٤) **عن عبد الله بن الحارث قال: (أكلنا مع رسول الله ﷺ شِواء في المسجد).**أخرجه ابن ماجه في موضعين (٣٣١١) وفيه ابن لهيعة و (٣٣٠٠) واسناده صحيح لكن ليس فيه ذكر (الشواء) وحسنه البوصيرى فقصر.وصححه ابن حبان (٢٢٣) وأحمد .

واته :جارێكیان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ لە مزگەوتدا گۆشتی برژاومان خوارد.

(١٠٥) **عن جابر بن عبدالله قال : قال رسول الله ﷺ:((نِعْمَ الإدامُ الخَلّ))** أخرجه الترمذي (١٨٤٠)ومسلم وأبوداود (٣٨٢٠) والنسائي .

واته: خۆشترین پێخۆر سركەیە .

وە كولەكە [١٠٦] ، حەڵواو هەنگوین[١٠٧]

---

(١٠٦)**عن حكيم بن جابر عن أبيه قال : دخلت على النبي ﷺ فرأيت عنده دُبّاء يُقَطَّعُ، فقلت: ماهذا؟ قال: ((نُكثر به طعامَنا)).** أخرجه ابن ماجه (٣٣٠٤)والترمذي (١٨٥٠) وصحح اسناده الالبانى واخرجه أبو الشيخ والطبرانى .

واته: چوومەماڵەوە بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ لەلایدا كولەكەم بینی لەت دەكرا، وتم: ئەمە چی‌یە؟ فەرمووی :خواردنەكەمان زۆری لەمەیە. یان: خواردنەكەمانی پێ زۆر دەكەین.

أبوعيسى دەفەرموێ: ئەو جابرە جابری کوڕی طارقەو دەڵێن: إبن أبی طارق یەکێکە لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ وە جگە لەم فەرمودەیە هیچی ترمان نەزانیوە کە گێڕابێتی‌یەوە.

**وعن أنس بن مالك قال: (كان النبي ﴿ﷺ﴾ يعجبه الدُّبّاءُ، فأُتي بطعام، أو دُعِي له، فجعلتُ أتَتَبَّعُهُ، فأضعه بين يديه، لما أعلم أنه يحبه).** اخرجه الترمذي بألفاظ متقاربة (١٨٥٠)و(١٨٥١) وأبو داود ومسلم (٢٠٤١) والبخاری .

واتە: پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾حەزی لەکولەکە بوو . جارێکیان خواردنیان بۆ هێنا، یان دەعوەتیان کردبوو بۆی، منیش بەدوای کولەکەکانی ناوشلەکەدا دەگەڕام و دەمخستە بەردەمی لەبەرئەوەی ئەمزانی حەزی لێ دەکات .

**وفي طريق ثانية (١٦٣): (إن خياطاً دعا رسول الله ﴿ﷺ﴾ لطعام صنعَه، قال أنس: فذهبت مع رسول الله ﴿ﷺ﴾ إلى ذلك الطعام، فَقَرَّبَ الى رسول الله ﴿ﷺ﴾ خبزاً من شعير، ومَرَقاً (وفي طريق ثالثة: ثريداً عليه دباء/٣٣٤) فيه دُبّاء وقديد ، قال أنس: فرأيت النبي ﴿ﷺ﴾ يتتبع الدُّباء حوالي القصعة، (وكان يحب الدباء) فلم أزَلْ أُحِبُّ الدُّبّاء من يومئذ).**

واتە: بەرگ دروویەك دەعوەتی پێغەمبەری کرد﴿ﷺ﴾ بۆ خواردنێك کە دروستی کردبوو. ئەنەس دەفەرموێ: منیش لەگەڵی چووم بۆ ئەو خواردنە. ئەوانیش نانی جۆو شلەی تریتیان خستە بەردەمی پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾کەکولەکەی بەسەرەوە بوو . یان کولەکەو (قەدید)ی تێدا بوو [کە قەدید گۆشتێکی سوێرکراوی وشك کراوەیە].أنس دەفەرموێت: پێغەمبەرم﴿ﷺ﴾ بینی بە دوای کولەکەکاندا دەگەڕا لە چواردەوری (قَصعة) کەدا [(قصعة) دەفرێکەو بەشی خواردنی (دە) کەس دەگرێت بەڵام (الصحفة)پێنج کەس لێی دەخوا] وەحەزی لەکولەکەبوو، منیش لەو ڕۆژەوە حەزم لەکولەکەیە .

(١٠٧)**عن عائشة قالت: (كان النبي ﴿ﷺ﴾ يحب الحلواء والعسل).** اخرجه البخاری ومسلم (١٤٧٤) وأبوداود والترمذي (١٨٣٣) وغيرهم .

واتە: پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ حەزی لەحەڵواو هەنگوین بوو .

**وە حەزی لە گۆشتی سەر ئێسقانی قۆڵی مەڕومالاَت بوو، وە هەر لەمەشدا بوو ژەهرخوارد کرا[(١٠٨)] وە حەزی لە تیۆڵە (تریت)[(١٠٩)] و گۆشت کردووە[(١١٠)]**

---

(١٠٨)**عن ابن مسعود قال: (كان النبي ﴿ﷺ﴾ يعجبه الذراع، قال: وَسُمَّ في الذراع، وكان يُرى أن اليهود سَمّوه).** أخرجه أبوداود (٣٧٨١) وابوالشيخ ص(٢٠٢) وهو مخرج في الصحيحة (٢٠٥٥).

واتە: پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾حەزی لە گۆشتی سەر قۆڵ دەکرد. دەفەرموێ: هەر بە گۆشتی قۆڵەوە بوو ژەهرخوار کراو (ابن مسعود) پێی وابوو کە وا جولەکە ژەهر

خواردیان کرد [ئەویش لە غەزوەی خەیبەردا ڕویداو زەینەبی کچی حارث بە گوێی جولەکەی کردو بۆی داناو پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ (لەلایەن جبریلەوە)هەواڵی پێ درا بەمەو دەستی هەڵگرت .زەینەبیش موسڵمان بوو ئەویش تۆڵەی لێ نەکردەوە .پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ پێ ی فەرموو: چی پاڵی پێوە نای وابکەی ؟ئەویش ووتی: وتم ئەگەر پێغەمبەر بێت زیانت پێ ناگەیەنێو ئەگەر پێغەمبەریش نەبیت ئەوا ڕزگارمان دەبێت لە دەستت ]بۆ ڕێگاکانی ئەم بەسەرهاتە بڕوانە المستدرك ٢١٩/٣ وفتح البارى ٤٩٧/٧ .

(١٠٩)**عن أبي موسى الأشعري عن النبي ﴿ﷺ﴾ قال: ((فَضْلُ عائشة على النساءِ، كفضلِ الثَّريد على سائر الطعام))** .اخرجه البخارى ومسلم (٢٤٣١) والنسائي والترمذي (١٨٣٥).

واتە: فەزڵی عائیشە بەسەر ئافرەتانی تردا وەکو فەزڵی تریت و تێوڵە وایە بەسەر خۆردنی تردا [تێوڵەو تریت: بریتیـیە لە تێکەڵاوی یەك لە نان لەگەڵ شلەو زۆربەی کات گۆشتی تێدایە].

(١١٠)**عن جابر بن عبدالله قال :أتانا النبي ﴿ﷺ﴾ في منزلنا، فذبحنا له شاة فقال: ((كأنهم علموا أنّا نحب اللحم)).وفي الحديث قصة ...**/ قال الالباني: اسناده صحيح رجاله كلهم ثقات واخرجه الدارمي وأحمد (٣٩٧/٣و٣٩٨) عنه مطولاً جداً . ثم رواه أحمد ٣٠٣/٣ من طريق اُخرى نحوه مختصراً وهى طريق المؤلف (الترمذى) رحمه الله . ولفظه: **(أتيت النبي ﴿ﷺ﴾ أستعينه في دَين كان على أبي. قال: فقال: آتيكم .قال: فقلت للمرأة: لا تكلمي رسول الله ﴿ﷺ﴾ ولاتسأليه . قال: فأتانا فذبحنا له داجناً كان لنا .فقال:(( ياجابر !كأنكم عرفتم حبنا للحم)).قال: فلماخرج قالت له المرأة: صل علي وعلى زوجي، أو صل علينا. قال: ((اللهم صل عليهم)) .قال: فقلت لها: أليس قد نهيتك .قالت : ترى رسول الله كان يدخل علينا ولا يدعو لنا !!).**

واتە: پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ هات بۆ ماڵمان و مەڕێکمان بۆ سەربڕی، ئەویش فەرموی: وەکو ئەوەی زانیبێتیان کە حەزمان لە گۆشتە. لەڕیوایەتەکەی تردا: هاتمە خزمەت پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ تا یارمەتیم بدات بۆ دانەوەی قەرزێك کە لەسەر باوکم بوو. دەفەرمویٚ: -

## وە هەندێ جار دەست نوێژی دەگرت دوای خواردنی[(١١١)]

---

ئەویش فەرموی: دێمە ماڵتان، دەفەرموێ: بە خێزانەکەم ووت: قسە لەگەڵ پێغەمبەردا ﴿ﷺ﴾ مەکەو داوای هیچی لێ نەکەیت، دەفەرموێ: پێغەمبەر﴿ﷺ﴾هات و دابەستەیەکمان هەبوو بۆمان سەربڕی. ئەویش فەرمووی: ئەی جابر ئەڵێی زانیتان حەزمان لە گۆشتە. دەفەرموێ: کاتێك ڕۆشت ژنەکەم پێ ی فەرموو: ئەی پێغەمبەری خوا دوعابکە بۆ من و مێردەکەم، یان دوعامان بۆ بکە، ئەویش فەرموی: خوایە بەزەییت

پێیاندا بێتەوە. دەفەرموێ: دوایی منیش پێم ووت: ئەرێ ئافرەت نەم ووت داوای هیچی لێ نەکەیت، ئەویش ووتی: ئایا تۆ وا دەبینیی‌و پێت وایە پێغەمبەر(ﷺ) بێتە ماڵمان و دوعامان بۆ ناکات!!

(١١١)**عن جابر قال: (خرج رسول الله (ﷺ) وأنا معه، فدخل على أمرأةٍ من الأنصار، فذبحت له شاة، فأكل منها، وأتته بِقِناع من رُطبٍ فأكل منه ،ثم توضأ للظهر وصلى ،ثم انصرف، فأتته بعلالة من عُلالةِ الشاة، فأكل، ثم صلى العصر، ولم يتوضأ).** أخرجه أصحاب السنن. الترمذي (٨٠) وقال الألباني: اسناده صحيح .

واتە: پێغەمبەری خوا(ﷺ)لەماڵ دەرچوو منیش لە خزمەتی‌دا بووم، چووە ماڵی ئافرەتێك لە ئافرەتانی ئەنصار، ئەویش مەڕێكی بۆ سەر بڕی‌و لێی خوارد، وە سینییەكی پڕ لە خورمای نەرم و تەڕی بۆ هێناو لەویشی خوارد، پاشان دەست نوێژی هەڵگرت بۆ نوێژی نیوەڕۆو نوێژی كرد، پاشان گەڕایەوەو ئەو ئافرەتە هەندێك لە پاشماوەی گۆشتی مەڕەكەی بۆ هێنایەوە، ئەویش لێی خواردو پاشان نوێژی عەسری كردو دەست نوێژیشی نەگرتەوە .

**وعن أبي هريرة (τ): (أنه رأى رسول الله (ﷺ) توضأ من ثَورِ أَقَطٍ، ثم رآه أكل من كَتِف شاةٍ، ثم صلى ولم يتوضأ.** أخرجه ابن ماجه (٤٩٣) ولفظه: **(أكل (ﷺ) كتف شاة فمضمض وغسل يديه وصلى)** وإبن خزيمة في صحيحه (٤٢) وابن حبان (٢١٧) وقال الالباني :اسناد حديث الباب صحيح على شرط مسلم، والترمذي (٧٩) مرفوعاً بلفظ: **((الوضوء مما مست النار ولو من ثور أقط)). قال: فقال له ابن عباس: يا اباهريرة ! أنتوضأ من الدهن ؟! أنتوضأ من الحميم ؟! قال: فقال ابو هريرة : يابن أخي إذا سمعت حديثاً عن رسول الله (ﷺ) فلا تضرب له مثلاً) .**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە كەوا پێغەمبەری خوای(ﷺ) بینیوە دەست نوێژی شتوە دوای خواردنی پارچە كەشكێك، پاشان بینیوویەتی لە شانی مەڕێكی خواردوەو نوێژی كردوەو دەست نوێژی نەشتووەتەوە .

وە حەزی لە خورما[١١٢] وە پاشماوەی كۆتایی خواردنەكەی دەكرد[١١٣] ئەگەر خواردن نەبوایە بەڕۆژوو دەبوو[١١٤] وە دوای نان خواردن

---

(١١٢) **عن أُم المنذر قالت: دخل عليٌّ رسولُ الله (ﷺ) و معه عليٌّ. ولنا دوالٍ معلقة ، قالت: فجعل رسولُ الله (ﷺ) يأكل ، وعليٌّ معه يأكل ، فقال رسول الله (ﷺ) لعليٍّ:((مه ياعلي فإنك ناقهٌ)).قالت: فجلس علي والنبي (ﷺ) يأكل، قالت: فجعلت لهم سِلقاً و شعِيراً ،فقال النبي (ﷺ) لعلي:((من هذا فأصب، فإن هذا أوفق لك)).** أخرجه ابوداود (٣٨٥٥) وابن ماجه والنسائي والحاكم (٤٠٧/٤) وقال : صحيح الاسناد و وافقه الذهبي .والترمذي وقال حديث جيد غريب .والحديث حسن انظر(الصحيحة) (٥٩). واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) هات بۆ ماڵمان و عەلی لەگەڵدا بوو. هێشوویەك لە

خورمای هەڵواسراومان هەبوو، پێغەمبەر(ﷺ) دەستی کرد بەخواردنیو عەلیش لەگەڵی دەی خوارد، پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە عەلی فەرمووی: بەسە تۆ مەخۆ ئەی عەلی دەمێك نیە نەخۆش بوویت . دەفەرمویٚ: ئەوەبوو عەلی دانیشت و پێغەمبەر (ﷺ) لیٚی دەخوارد. دەفەرمویٚ: منیش چووم خواردنێکم بۆ لێنان کەپێك هاتبوو لە سلق و جۆ. پێغەمبەر(ﷺ) بە عەلی فەرموو: ئا لەمە بخۆ، ئەمە باشترە بۆ تۆ.

(١١٣)**عن أنس أن رسول الله (ﷺ): (كان يعجبه الثُّفْلُ). قال عبدالله: يعني ما بقي من الطعام.** أخرجه أحمد والحاكم (الجامع الصغير) وابن سعد (٣٩٣/١) وابو الشيخ والحاكم (١١٥/٤-١١٦) وبيض له هو و الذهبي ،واسناده صحيح على شرط الشيخين وزاد ابن سعد : **(يعني الثريد)** .

واتە: پێغەمبەری خوا(ﷺ) حەزی لە پاشماوەی کۆتایی خواردن دەکرد ( واتە لە تریتدا).

(١١٤) **عن عائشة أم المؤ منين(رضيالله عنها) قالت: كان النبي (ﷺ) يأتيني فيقول: ((أعندك غداء ؟)) فأقول: لا، فيقول((إني صائم)) قالت: فأتاني يوماً، فقلت: يارسولَ الله ! إنه أُهديَت لنا هديةٌ، قال(( وماهي ؟))قلت: حَيسٌ. قال: ((أماإني أصبحت صائماً)). قالت :ثم أكَلَ** /اخرجه الترمذي (٧٣٤) وقال حديث حسن .وهومخرج في الإرواء الغليل (٩٦٥) ،وفي مسلم (١٩٥١،١٩٥٠) وغيره : **(لقد كان النبي (ﷺ) يدخل البيت ويقول: ((هل عندكم طعام))؟ يقولون: ماعندنا. فيقول: ((اللهم إني صائم))** .

واتە: عائیشە دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) عادەتی وابوو دەهاتە ماڵەوە بۆ لام و دەیفەرموو: خواردنت لایە؟ [واتەخواردنی بەیانی؟] منیش دەمووت: نەخێر . ئەویش دەیفەرموو. دەی کەواتە ئەمڕۆ بە ڕۆژووم. دەفەرموێت: ڕۆژێك هات بۆ ماڵم و عەرزم کرد: ئەی پێغەمبەری خوا دیارییەکیان بۆ ناردوین. فەرمووی: کامەیەو چییە؟ ووتم(حەیس)ە [کە بریتییە لە خورما لەگەڵ ڕۆن و کەشك یان ئارد تێکەڵ دەکرێت ]. ئەویش فەرمووی: من ئەم بەیانیيە بەڕۆژووبووم. دەفەرمویت: پاشان لیٚی خوارد . [ ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە دروستە ڕۆژووی سوننەت بشکێنرێت ].

دەستی دەسڕی [١١٥] . وە دەیفەرموو: لە سەرەتاوە(بسم الله) بکەن ئەگەر بیرتان چوو بڵێن (بسم الله أوَّلَهُ وآخِرَهُ) [١١٦] . وە کە سفرەیان لە بەردەمیدا

---

(١١٥) **عن ابن عباس: أن رسول الله (ﷺ) خَرج من الخلاء، فَقُرِّبَ إليه الطعامُ، فقالوا: ألا نأتيك بِوَضوءٍ ؟ قال:((إنما أمِرتُ بالوضوء إذا قمتُ إلى الصلاة)).** وفي رواية /١٨٧ :فقال**((أأُصلي فأتوضأ؟))**. رواه ابو داود (٣٧٦٠) والنسائي والترمذي فيه(١٨٤٨) ومسلم بنحوه. و قال الترمذي: حديث حسن صحيح.

واتە: پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەسەرئاو هاتە دەرەوەو خواردنێکی لێ نزیک کرایەوەو پێیان فەرموو: ئایا ئاوی دەست نوێژت بۆ ئامادە نەکەین ؟ ئەویش فەرمووی: فەرمانم پێ کراوە کە لەکاتی هەستانم بۆ نوێژ دەست نوێژ بشۆم. لە ڕیوایەتەکەی تردا: ئایا نوێژ دەکەم تاپێویست بکات دەستنوێژ بشۆم ؟!

وە دەست سڕینی لەم فەرمودەیەدا دیارە :**عن کعب: (رأيت النبي (ﷺ) يلعق أصابعة الثلاث من الطعام)** و في رواية لمسلم: **(و يلعق يده قبل أن يمسحها)**.

واتە: پێغەمبەری خوام (ﷺ)بینی هەرسێ پەنجەی (لە ڕیوایەتەکەی تردا: دەستی) دەلێسایەوە پێش ئەوەی بیسڕێت .

بەڵام فەرمودەکەی سەلمان کەباسی دەست نوێژ گرتن یان دەست شتن دەکات کە بەرەکەتە لە پێش وپاشی نان خواردنەوە " فەرمودەیەکی ضەعیفە (سلسلة الضعيفة ١٦٨).

(١١٦) **عن عائشة قالت: قال رسولُ الله (ﷺ): ((إذا أكل أحدُكم فَنَسِيَ أن يذكرالله تعالى على طعامه فليقل: (بسم الله أوله وآخرَهُ) ))**. اخرجه ابوداود (٣٧٦٧) والنسائي والترمذي (١٨٥٩) وقال : حديث حسن صحيح .انظر ارواء الغليل (١٩٦٥) والكلم الطيب (١٨٢) .

واتە: ئەگەر یەکێك لە ئێوە خواردنی خواردو بیری چوو ناوی خوای گەورە بهێنێ لە سەرەتایەوە ئەوا کەی بیری هاتەوە با بڵێ: بە ناوی خوا لە سەرەتاو کۆتاییەکەیدا.

**وعن عُمر بن أبى سَلِمة أنه: دخل على رسول الله (ﷺ) وعنده طعام فقال: ((ادنُ يابُنَيَّ! فَسَمِّ الله تعالى، وكل بِيَمينك، وكُل مما يَليكَ))**. اخرجه البخارى ومسلم (٢٠٢٢) والترمذى (١٨٥٨) وغيرهم .

واتە: عومەری کوڕی ئەبی سەلەمە چووە ماڵەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) لە کاتێکدا خواردنی لە بەردەمدا بوو فەرمووی: کوڕی خۆم نزیك بەرەوەو ناوی خوا بهێنەو بەدەستی ڕاست و لە بەردەمی خۆتەوە بخۆ .

لادەبرد سوپاس و ستایشی خوای گەورەی دەکرد[١١٧]. پەرداخی خواردنەوەکەشی لە دارێکی ئەستوور لە داری(النُّضار) دروست کرا بوو بە ئاسن لێوارەکانی تەنرابوو[١١٨] .

---

(١١٧)**عن أبى أُمامة قال: كان رسول الله (ﷺ) إذا رفعت المائدة من بين يديه يقول: ((الحمدلله حمداً كثيراً طيباً مباركاً فيه،غير مُوَدَّعٍ** (وفي رواية البخارى: **غير مكفي ولا مودع)، ولامستغنى عنه ربنا))**. اخرجه ابوداود (٣٨٤٩) والبخاري والنسائي والترمذي (٣٤٥٢) وصححه.

واتە: پێغەمبەریخوا ﴿ﷺ﴾ ئەگەر سفرەیان لەبەردەستیدا هەڵبگرتایەو لایان ببردایە دەیفەرموو: سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە سوپاسێکی زۆری پاکی پیرۆزبێت، کە پێویستمان بەکەسی تر نییەو بەسمانەو واز لەو سوپاس کردنەی خوای گەورەش ناهێنین و بەبێ بچڕان سەرقاڵین پێوەی ئەی پەروەردگارمان .

بەڵام ئەو فەرمودەیەی کە فەرموویەتی:(**الحمدلله الذی أطعمنا وسقانا، وجعلنا مسلمین**) **فەرمودەیەکی ضەعیفە** (بڕوانە تخریج الکلم الطیب ١٨٨) .

(١١٨)**عن ثابت قال: (أخرج إلینا أنسُ بنُ مالك قَدَحَ خشبٍ غلیظاً مُضَبَّباً بحدید، فقال: یا ثابت! هذا قَدَحُ رسول الله ﴿ﷺ﴾)**. أخرجه الترمذي (١٨١٧) وأحمد ومسلم والنسائي واخرجه البخاری في (کتاب الاشربة) عن عاصم الأحول قال: **(رأیت قدح النبي ﴿ﷺ﴾ عند أنس بن مالك وكان قد تصدع ،فسلسله بفضة.قال: وهو قدح جید عریض من نضار. والنضار . خشب معروف)**.

واتە: ئەنەسی کوڕی مالك پەرداخێکی لە دار دروست کراوی ئەستوری بۆ دەرهێنایین کە بە قەیدی ئاسن دەورە درابوو تەنرابوو [تا لە شکان و لەت بوون بیپارێزێت ] . فەرمووی: ئەی ثابت ئەمە پەرداخی پێغەمبەری خوایە ﴿ﷺ﴾. لە ڕیوایەتەکەی بوخاری دا دەفەرموێ: عاصمی ئەحوەل دەفەرموێ: پەرداخەکەی پێغەمبەرم ﴿ﷺ﴾ بینی لەلای ئەنەسی کوڕی مالك بوو درزی تێ بوو بوو دەسکەکەی لە زیوو دروستکرا بوو .ئەفەرموێ: پەرداخێکی چاکی ئەستوور بوو لە داری (نوضّار) کەدارێکی ناسراوە دروست کرابوو .

## خواردنەوەیان تیایدا دەدایە[١١٩] وە لە میوەشدا تروزی بە خورمای تەڕەوە دەخوارد[١٢٠] وە کاڵەك بە خورمای نەرم و پێگەیشتوو[١٢١] .

---

(١١٩)**عن أنس قال: (لقد سَقَیْتُ رسولَ الله ﴿ﷺ﴾ بهذا القَدَح الشرابَ كله : الماءَ والنَّبیذَ و العسلَ واللبَن)**. اخرجه مسلم (٢٠٠٨) وأبو الشیخ (٢٢٢) وزاد في رِوایة: **(فلولا أني رأیت أصابعه ﴿ﷺ﴾ في هذه الحلقة لجعلت علیها الذهب والفضة)**. واسناده صحیح واخرجه الحاكم (١٠٥/٤) وصححه علی شرط مسلم ووافقه الذهبی .

واتـه: بـەم پەرداخـە خواردنـەوەم داوە بـە پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) لـە ئـاو ونـەبیـذ [کـە بریتییە لە ئاو و چەند دەنکە خورمایـەکی تـێ دەکرێت تاشیرین دەبێ . سـەرەتای شـەو خورماکـەیان بـۆ تـێ دەکـردو بـەیانی لێـی دەخـواردەوە ] وە هـەنگوین و شـیر .

لەڕیوایەتەکـەی أبوالشـیخ دا ئەمەشـی لەگەڵدایـە: ئەگـەر پەنجـەکانی پێغەمبـەرم (ﷺ) نەبینیایە لەناو ئەم دەسکەدا ئەوا ئاڵتون و زیوم دەدا بەسەری دا.

(١٢٠) **عن عبدالله بن جعفر قال: (كان النبي (ﷺ) يأكل القِثّاء بالُّرطَب)** اخرجه الترمذي (١٨٤٥) والبخاري و مسلم وأبوداود (٣٨٣٥) وابن ماجه ٠ انظر (الصحيحة) (٥٥٦)٠

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ترۆزی بەخورمای نەرم و تەڕەوە دەخوارد .

(١٢١) **عن عائشة (رضيالله عنها): (أن النبيّ (ﷺ) كـان يأكـل البِطّـيخَ بالُّرطَـب)**.اخرجه الترمذي (١٨٤٤) وأبوداود (٣٨٣٦) واالنسائي مختصراً ورواه جَمع آخر . قال الألبـاني : إسـناد بعضـهم صـحيح علـى شرط الشيخين وحسنه المؤلف (أي الترمذي) .

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاڵەکی بە خورمای تەڕو نەرمەوە دەخوارد.

**وعن أنس بن مالك قال: (رأيت رسول الله (ﷺ) يجمع بين الخِربِزِ والرُّطَب).** أخرجه أحمد و النسائي ( الجامع الصغير ) ( ٥٨ ) قال الالباني : اسناده صحيح .

واتە: پێغەمبەری خوام (ﷺ) بینی کە کاڵـەکی بەخورمای تـەڕەوە دەخـوارد [ الخربـز: لە فارسیەوە وەرگیراوە بریتییە لە کاڵەك. مەبەستیش پێـی جۆرە ڕەنگ زەردەکەیـەتی . چونکە ساردییەکی تێدایە خورماکە هاوسەنگی دەکاتەوە..].

وە کە یەکەم نۆبەرەی میوەی دەبینی دەپاڕایەوەو دەیدا بە بچوکترین منداڵ لەو شوێنەدا(١٢٢) . وە هەرگیز عەیبی لە خواردن نەگرتووە(١٢٣) .

---

( ١٢٢) **عن أبي هريرة قال: كان الناسُ اذا رأوا أول الثَّمر جاؤوا به رسولَ الله (ﷺ) فـإذا أخذه رسول الله (ﷺ) قال: ((اللهم بارك لنا في ثمارنا، وبارك لنا في مدينتنا، وبارك لنا في صاعنا وفي مُدنا، اللهم ان ابراهيم عبدك وخليلك ونبيك، واني عبدك ونبيك، وانه دعـاك لمكـة، واني ادعوك للمدينة بمثل مادعاك به لمكة، ومثله معه)) قال: ثم يدعو اصغر وليد يراه، فيعطيـه ذلك الثمر).** اخرجه مسلم ( ١٣٧٣ ) والترمذي ( ١٤٥١ ) وابن ماجه ( ٣٩٢٩ ) .

واتە: خەڵکی کە یەکەم نۆبەرەی میوەیان دەبینی دەیان هێنا بۆ پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ ئەویش کە وەری دەگرت دەیفەرموو: خوایە بەرەکەت بخەرە ناو میوەکانمان و شارەکەمان، وە بەرەکەت بخەرە ناو صاع [ کەدەفرێکە چوار مشت دەگرێت ] و (مُد ) مشتمانەوە . خوایە ابراهیم پێغەمبەر (u) کەبەندەو خۆشەویست و پێغەمبەری خۆتەو منیش بەندەو پێغەمبەرتم ، خوایە ئەو پاڕایەوە لێت بۆ شاری مەککە [ئەویش ئەوە بوو فەرمووی : ﴿ ربنا إني أسكنت من ذريتي بواد غيرذي زرع عند بيتك المحرم، ربنا ليقيموا الصلاة فاجعل افئدة من الناس تهوي اليهم وارزقهم من الثمرات لعلهم يشكرون ﴾ سورەتی إبراهيم ئایەتی( ٣٧ ).

واتە: پەروەردگار من ( هاجەرو اسماعیل )م لە نەواکانم لەم دۆڵە بیٚ کشت وکاڵەدا لەلای ماڵە حەرام کراوەکەی تۆدا جێگیر کردووە . پەروەردگار با نوێژ ئەنجام بدەن و دڵی هەندیٚ لە خەڵکی ( کەموسوڵمانانە) ڕابکێشی بە لایاندا تابێن بۆ لایان و چوار دەوریان قەرەباڵغ ببێت و لە میوەهات رزقیان بدە تا سوپاسی تۆ بکەن]. ساخوایە منیش لێت دەپاڕێمەوە بۆ شاری مەدینە بە وێنەی ئەوەی کە ئیبراهیم پێغەمبەر (u)پیٚی پاڕایەوە بۆ شاری مەککە. وە هاووێنەی ئەویش لەگەڵی. دەفەرمویٚ: پاشان بچوکترین منداڵی بانگ دەکرد کە لەو ناوەدا بەرچاو بکەوتایەو ئەو میوەیەی دەدایە [بۆیە ئەو میوەیە دەدریٚ بە منداڵ چونکە زۆری پیٚ خۆشە. یان لەبەر ئەوەیە کە میوەکە نۆبەرەو ساوایەو دەدریٚ بەمەخلوقێك کە هاووێنەی ئەو بێت کە منداڵە . والله اعلم ] .

( ١٢٣ ) **( ماعاب طعاما قط، إن أعجبه أكله، وإن لم يعجبه لم يأكله )** البخاري ٣/ ١٣٠٦ رقم (٣٣٧٠ ) ومسلم ٣ / ١٦٣٢ رقم ( ٢٠٦٤ ) .

واتە: هەرگیز پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ عەیبی لە خواردن نەگرتووە، ئەگەر حەزی لیٚ بکردایە دەیخواردو ئەگەر حەزی لیٚ نەبوایە نەیدەخوارد .

## خواردنەوەی پێغەمبەری خۆشەویست ﴿ﷺ﴾

حەزی لە خواردنەوەیەك بووە شیرین و سارد بێت [(١٢٤)] وە فەرموویەتی: جگە لە شیر هیچ شتێك جێگەی خواردن و خواردنەوە ناگرێتەوە[(١٢٥)] هەندێك کات و لە ناچاریدا بە پێوەو زۆربەی کاتیش بە دانیشتنیشەوە ئاوی خواردوەتەوە[(١٢٦)] .

---

( ١٢٤ ) **عن عائشة (رضيالله عنها) قالت :(كان أحب الشراب إلى رسول الله ﴿ﷺ﴾ الحلُو البارد).** أخرجه الترمذي ( ١٨٩٧ ) و له شاهد من حديث ابن عباس انظر الصحيحة ( ٣٠٠٦ ) وهو حديث صحيح .

واته: خۆشترین خواردنەوەیەك بەلای پێغەمبەری خواوە ﴿ﷺ﴾ ئەوە بووە کەشیرین و سارد بێت .

( ١٢٥ ) **عن ابن عباس (τ) قال : دخلت مع رسول الله ﴿ﷺ﴾ انا وخالد بن الوليد على ميمونة فجاءتنا بإناء من لَبَنٍ ، فشرب رسول الله ﴿ﷺ﴾ وانا على يمينه، وخالد عن شماله فقال لي: (( الشربة لك، فان شئتَ آثرت بها خالداً)).فقلت: ما كنت لأوثر على سؤرك احداً، ثم قال رسول الله ﴿ﷺ﴾:((من أطعمه الله طعاماً فليقل: (اللهم بارك لنا فيه وأطعمنا خيرا منه)ومن سقاه الله عزوجلّ لبنا فليقل: ( اللهم بارك لنا فيه وزدنا منه)، ثم قال: قال رسول الله ﴿ﷺ﴾: (( ليس شي يُجزيء مكان الطعام والشراب غير اللبن ))** رواه ابن ماجه (٣٤٢٦) مختصرا والترمذي ( ٣٤٥١ ) باسناده ومتنه وقال حديث حسن ( أي لغيره ) انظر الصحيحة ( ٢٣٢٠ ) .

واتە: عبداللّەی کوڕی عەباس دەفەرموێ : من و پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ لەگەڵ خالدی کوری وەلید چوینە ماڵی مەیمونە ئەویش کاسێك شیری بۆ هێناین . پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ لێ خواردەوەو منیش کە لەلای ڕاستیدا بووم و خالد کەلای چەپیدا بوو پێ فەرمووم : سەرەی تۆیە بیخۆیتەوە یان ئەگەر ئارەزوو دەکەیت پێش خۆت بیدە بە خالد .منیش ووتم : هەرگیز پاشماوەکەی جەنابت نادەم بەکەس لە پێش خۆمەوە ، پاشان پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: هەرکەسێك خوای گەورە خواردنی دایە بابڵێ:(( **اللهم بارك لنا فيه و أطعمنا خيرا منه**)) واتە: خوایە بەرەکەت بخەیتە ناو ئەم خواردنەوەو لەمە چاکترمان بەیتێ ، وە هەرکەسێك خوای گەورە شیری پێ بەخشی بابڵێ (( **اللهم بارك لنا فيه وزدنا منه** )) واتە: خوایە بەرەکەت بخەیتە ناو ئەم شیرەوەو لەمەمان بۆ زیاد بکە . پاشان فەرمووی: هیچ شتێك جێگای خواردن و خواردنەوە ناگرێتەوە جگە لە شیر .

( ١٢٦ )**عن عمرو بن شعيب عن ابيه عن جده [عمرو بن شعيب بن محمد بن عبدالله بن عمرو بن العاص ، وأراد بجده جد ابيه وهو عبدالله]قال: (رأيت رسول الله ﴿ﷺ﴾ يشرب قائما وقاعدا)**
أخرجه الترمذي ( ١٨٨٤ ) وقال :حسن صحيح وله شواهد كثيرة . وحسنه الالباني .

واتە:پێغەمبەری خوام بینیوە﴿ﷺ﴾ بەپێوەو بەدانیشتنەوە خواردنەوەی خواردۆتەوە،

وە لەکاتی خواردنەوەی دا سێجار لەدەرەوەی کاسەکەدا هەناسەی دەدا . [١٢٧]

---

**ینی** / لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە کە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ نەهی کردوە بەڵکو زەجرەی ئەوەی کردووە کە بەپێوە بخورێتەوەو فەرمانی کردووە کەهەر کەسێك بەپێوەخواردیەوە با بیرشێنێتەوە ، بۆیە زاناکان لە جەمع کردنی ئەم فەرموودانەدا جیاوازن . ئیمامی الطحاوي لە ( المشكل ) (١٨/٣و٢١)پێی وایە ئەم نەهیە بۆ تەحریمە، ئیمامی نەوەوی پێی وایە بۆ تەنزیهە . بەڵام ئیمامی ئەلبانیش هەمان ڕای یەکەمی هەیە ( الصحيحة ) ١٧٥– ١٧٧ .

**وعن ابن عباس(رضي الله عنهما )قال:( سقيت النبي ﴿ﷺ﴾ من زمزم. فشرب وهو قائم).** اخرجه البخاري ومسلم ( ٢٠٢٧ ) والترمذي والنسائي وابن ماجه .

واتە: لە ئاوی زەمزەمم دا بەپێغەمبەر﴿ﷺ﴾ و ئەویش هەر بە پێوە خواردییەوە .

**وعن النَّزَّال بن سَبْرَة قال :(أُتي عليّ (τ) بكوز من ماء وهو في الرحبة، فاخذ منه كفا فغسل يديه ومضمض واستنشق ، ومسح وجهه وذراعيه ورأسه ، ثم شرب منه وهو قائم ، ثم قال: هذا وضوء من لم يحدث ، هكذا رايت رسول الله ﴿ﷺ﴾ فعل)** اخرجه البخاري واحمد وابوداود ( ٣٧١٨ ) وغيرهم.

واتە: لە شەربەیەکدا ئاویان هێنا بۆ عەلی (ڕەزای خوای لێ بێت)لەکاتێکدا ئەو لە (ڕەحبە ) واتە (فراوان دا) بوو [کە شوێنێکە لە کوفە یان مەبەستی لە مزگەوتدا بووە کەشوێنێکی فراوانە] ئەویش پڕ مستێکی لێ دەرهێناو هەردوو دەستی پێ شت و ئاوی لە دەم و لووتی وەردا، وە دەستی تەڕی بەدەم و چاوو قۆڵ و سەریدا هێناو ئینجا هەر بە پێوە لێی خواردەوە پاشان فەرمووی : ئەمە دەست نوێژی کەسێکە کەدەست نوێژی نەشکابێ [کەدەست نوێژ بەمانا زمانەوانییەکەیو مەبەست پێی پاك کردنەوەیە ] من پێغەمبەریخوام ﴿ﷺ﴾ بینیوە ئاوهای کرد .

( ١٢٧ ) **عن انس بن مالك (τ): ( وفي طريق اخرى/ ٢١٤: كان أنس يتنفس في الإناء ثلاثا وزعم انس): (أن النبي ﴿ﷺ﴾ كان يتنفس في الاناء ثلاثاً اذا شرب، ويقول: هو أمرأ و وأروى)** اخرجه مسلم ( ٢٠٢٨ ) الترمذي ( ١٨٨٥ ) وقال: حسن غريب ،وابوداود والنسائي انظر( الصحيحة) (٣٨٧).

واتە: ئەنەسی کوڕی مالك (ڕەزای خوای لێ بێت) لەکاتی خواردنەوەدا سێ جار لە دەرەوەی جامەکەدا هەناسەی دەداو دەیفەرموو: پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ سێجار هەناسەی دەدا کاتێ خواردنەوەی دەخواردەوەو دەیفەرموو: ئەوە ئاسان وسوکترە بۆگەدەو تینوێتی دەشکێنێ .

وە لە فەرموودەیەکی تردا هاتووەکە( **كان إذا شَرِبَ تنفس ثلاثا ويقول: هو أهنأ وأمرأ وأبرأ).** صحيح جامع الصغير مجلد(٤) رقم الحديث ( ٤٦٢٠ ) .

**(أهنأ وامرأ)**واتە: خۆشترو ئاسانترە لەسەر گەدە. وە(**أبرأ**)واتە: سەلامەت ترە لە نەخۆشیو ناڕەحەتی.

## شێوازی قسەو گوفتاری پێغەمبەر﴿ﷺ﴾

پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ ووتەکانی ڕوونو بڕگە بڕگە بووەوەو هەر کەسێك بیبیستایە لەبەری دەکرد[١٢٨] . وە سێ بارەی دەکردەوە تا خەڵکەکە تێی بگات[١٢٩] وەهەموو قسەو ووتەکانی ڕاستی بووە[١٣٠] .

(١٢٨) **عن عائشة(رضي‌الله عنها)قالت: (ماكان رسول الله ﴿ ﷺ ﴾ يَسرُدُ كَسردِكم هـذا، ولكنه كان يتكلم بكلام بيّنٍ فَصل، يحفظه مـن جَلَـسَ اليـه).** اخرجـه البخـاري و مسـلم و أبـوداود مختصرا و الترمذي (٣٦٤٣) وقال: ( حديث حسن صحيح ) واسناده حسن .

**واتە: پێغەمبەری خوا ﴿ ﷺ ﴾ وەکو ئێستای ئێوە قسەی بە پەلە نەدەکرد . بەڵکو قسـەو ووتـەکانی ڕوون وئاشـکرا بـووەو بـەینی دەخسـتە نێـوان رسـتەکانەوە، بـە شێوەیەك ئەوەی لەگەڵی دانیشتایە لە بەری دەکرد .**

**وە ( كان يحدث حديثاً لو عَدَّهُ العادُّ لأحصاه )** متفق عليه .

**واتە:ووتەکانی بە جۆرێك بوو ئەگەر کەسێك بیویستایە بیژمێرێ دەیژمارد.**

(١٢٩) **عن أنس بن مالك قال: (كان رسول الله ﴿ ﷺ ﴾ يعيد الكلمة ثلاثاً ، لِتُعقل عنه )** اخرجه البخاري ( رقم – ٦٥ – مختصره ) بلفظ : **(حتى تفهم عنه )** والترمذي ( ٣٦٤٤) وقال: حديث حسن صحيح . بلفظه و متنه .

**واتە: پێغەمبەری خـوا ﴿ ﷺ ﴾ هەندێ ووشـەی سـێ بارە دەکردەوە هـەتا خـەڵکی لێی تێ بگات [واتە ئەو ووشە قورسانەی کە پێویستی بە چەند بارەکردنەوە هەیە ].**

(١٣٠) **پێغەمبەریخوا ﴿ ﷺ ﴾ بە عبداللّەی کوری عمروی فەرموو:** (( **اكتُب فو الـذي نفسي بيده ، ماخرج مني إلا الحق )).** حديث حسن رواه ابوداود انظر مختصر الشمائل . زينوو .

**واتە: فەرموودەکانم بنوسـە . سوێند بـەو خوایـەی نەفسـی منـی بەدەسـتە جگـە لـە هەق لە زوبانی منەوە دەرناچێت .**

**زۆربـەی کـاتیش بێـدەنگ بـووە[١٣١]، بـەڵام لـەکاتی ووتاردانـدا دەنگـی هەڵـدەبڕی[١٣٢]. وە لـەنێوان قسـەکانیدا داوای لێ خـۆش بوون(اسـتغفار)ی دەکـرد لـە خـوای گـەورە بـەجۆری دەیانبیسـت لـە مەجلیسـدا ( ١٠٠ ) جـار دووبارەی دەکردەوە [١٣٣] .**

---

(١٣١) **( كان رسول الله ﴿ ﷺ ﴾ طويل الصمت ).** رواه احمد باسناد حسن .

واتە: پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ زۆر جار بێ دەنگ بووە.

وە فەرموویەتی: **(( مَـنْ صَمَتَ نجا )).** صحيح جامع الصغير مجلد (٥) رقم (٦٢٤٣)

واتە: هەرکەسێ بێ دەنگ بێت لە قسەکردنی بەتاڵ ڕزگاری بووە .

(١٣٢) **كان رسول الله ﴿ﷺ﴾ اذا خطب احمرّت عيناه، وعلا صوته، واشتد غضبه، حتى كأنّه مُنذر جيش يقول: صبّحكم ومسّاكم).** رواه مسلم .

واتــە: پێغەمبــەری خــوا ﴿ﷺ﴾ کــەووتاری دەدا هــەردوو چــاوەکانی ســوور هەڵدەگەڕان و دەنگی بەرز دەکردەوەو ڕق و تووڕەیی دەجۆشا، بەجۆرێ دەتووت ئاگاداری خەڵکی دەکاتەوە لە هاتنی سوپایەك و دەڵێ: بەیانی یان ئێوارە دەدەن بەسەرتاندا .

( ١٣٣ ) لـە ابـن عمـرەوە فەرمویـەتی: پێغەمبـەری خـوا ﴿ﷺ﴾ پـێش ئـەوەی هەستێ لە مەجلیسێکدا دەیانژمارد سەد جار دەیفەرموو: **(( ربِّ اغفر لي وتب عليّ انك أنـت التـوّاب الغفـور)) .** رواه الترمذي وغيره . انظر صحيح الترمذي ٣ / ١٥٣ وصحيح ابن ماجه٢/٣٢١ ولفظه للترمذي .

## پێکەنینی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾

پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ زۆردەم بەخەندە بووەو هەرگیز قاقای نەکردووە لە کاتی پێکەنیندا [(١٣٤)] ، بەڵام هەندێ جاری وا هەبووە ددانەکانی دواوەی دەرکەوتووە لەکاتی پێکەنیندا[(١٣٥)] .

---

( ١٣٤) **عن عبدالله ابن الحارث بن جزء (τ) انه قال: (ما رأيت أحداً اكثر تبسماً من رسـول الله ﴿ﷺ﴾)** ومن طريق اخرى عنه قال : **(ماكان ضَحِكُ رسول الله ﴿ﷺ﴾ إلا تبسـما /٢٢٨)** اخرجه الترمذي ( ٣٦٤٥ ) وحسنه في بعض النسخ واحمد ٤/١٩٠ و ١٩١ وصححه الالباني.

واته: هیچ کەسێکم نەبینیوە ئەوەندەی پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ زۆردەم بەخەندە بوو بێ ، لە ڕیوایەتەکەی تردا: پێکەنینی پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ هەر زەردەخەنەکردن بووە.

**وعن جرير بن عبدالله (τ)قال: (ماحجبني رسول الله ﴿ﷺ﴾ منذ اسلمت ، ولا رآني إلا ضحك)** وفي رواية : **( الا تبسّم/ ٢٣١ )** . اخرجه البخاري و مسلم ( ٢٤٧٥ ) و غيرهم .

واتە: لەوڕۆژەوەی موسوڵمان بووم پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ خۆی لێ حەشار نەداوم و هەرگیز نەیبینیوم ئیلا زەردەخەنەی کردووە .

(١٣٥) لەوانە: **عن أبي ذر (τ) قال : قال رسول الله ﴿ﷺ﴾: (( اني لأعلم اول رجل يدخل الجنة ، وآخر رجل يخرج من النار: يؤتي بالرجل يوم القيامة فيقال: اعرضوا عليه صغار ذنوبه، ويخبّأ عنه كبارُها ، فيقال له: علمتَ يوم كذا. كذا و كذا ، وهو مقر لاينكر وهو مشفق من كبارها، فيقال: اعطوه مكان كل سيئةٍ حسنةً ، فيقول: إن لي ذنوباً لا أراها ههنا ! ) قال ابو ذر: (فلقد رأيت رسول الله ﴿ﷺ﴾ ضحك حتى بدت نواجذه )** . اخرجه مسلم (١٩٠) والترمذي (٢٥٩٩) وقال : حديث حسن صحيح. وصححه الالباني .

واتە: من دەزانم یەکەم کەس کە دەچێتە بەهەشت و کۆتا کەس کە لە ئاگر دەهێنرێتە دەرەوە کێیە، لە رۆژی دوایی‌دا پیاوێك دێنن پێی دەوترێ: گوناهە بچووکەکانی خۆی بخەنە ڕووی و نیشانی بدەن و گوناهە گەورەکانی بشارنەوە . پێی دەڵێن: لە فلانە ڕۆژدا ئاواو ئاوات کرد، ئەویش دانی پیادەنێ و ئینکاری ناکات و ئەشترسێ لەگوناهە گەورەکانی کە کردویەتی و بخوێنرێتەوە بەلام ناخوێنرێتەوە. پێی دەوترێ: لەجێی هەموو خراپەیەك چاکەیەکی بدەنێ. ئەویش دەڵێ: من کۆمەڵە گوناهێکم هەبووە و لێرەدا ئەمرۆ نایبینم !! [ واتە ئەو ئەوجا دان دەنێ بەوەدا کە گوناهی تریشی هەیە ]. ئەبو ذەر دەفەرموێت: ئالێرەدا پێغەمبەری خوام ﴿ﷺ﴾ بینی پێکەنی بە جۆرێ ددانەکانی دواوەی دەرکەوتن .

**وعن عبدالله بن مسعود (τ)قال: قال رسول الله ﴿ﷺ﴾: (إني لأعرف آخر أهل النار خروجاً، رجل يخرج منها زحفا فيقال له: انطلق فادخل الجنة، قال: فيذهب ليدخل الجنة فيجد الناس قد أخذوا المنازل ، فيرجع فيقول : يارب قد أخذ الناس المنازل! فيقال له: اتذكر الزمان الذي كنت فيه؟ فيقول له: نعم ، قال: فيقال له: تمن ، قال: فيتمنى ، فيقال له: فان لك الذي تمنيت وعشرة أضعاف الدنيا، قال: فيقول: اتسخر بي وانت الملك !)) قال : فقد رأيت رسول الله ﴿ﷺ﴾ ضحك حتى بدت نواجذه).** اخرجه البخاري ومسلم (١٨٦) والترمذي وابن ماجة .

واتە: من دەزانم کۆتا کەس کێیە کە لە دۆزەخ دێتە دەر . پیاوێکە بە چنەکڕێ دێتە دەرەوەو پێی دەوترێ : بچۆرە ناو بەهەشت ، ئەویش دەچێت تەماشا دەکات خەڵکەکە هەرکەس و چۆتە شوێن و مەنزڵگای خۆی . دەگەڕێتەوەو دەڵێ : پەروەردگار خەڵکی شوێن و مەنزڵگاکانیان گرتووە ! پێی دەوترێت : ئایا ئەو زەمانەت بیرە کە تیایدا دەژیایت لە دونیادا ؟ دەڵێ : بەڵێ، دەفەرمووێ : پێی دەوترێت : دەسا ئاوات بخوازە، ئەویش ئاوات دەخوازێ، پاشان پێی دەوترێ : دەسا ئەوەی تۆ ئاواتت بۆ خواست و (

ده ) ئەوەنـدەی دنیـات دەدرێتـیٚ، فـەرمووی : ئـەویش دەڵـێ: ئایـا پـەروەردگار گاڵتـەو شـۆخیم پـیٚ دەکـەیت کـە تـۆ پادشـاو خـاوەنی ڕۆژی دواییـت ! دەفـەرمویٚ: پێغەمبـەری خوام ﴿ﷺ﴾ بینی پێکەنی هەتا ددانەکانی دواوەی دەرکەوتن .

**علي بن ربيعة قال : شهدت عليا (τ)أُتيَ بدابة ليركبها ، فلما وضع رِجلَه في الرِّكاب قال : بسم الله ، فلما استوى على ظهرها قال : الحمد الله، ثم قال** ﴿ سبحان الذي سخر لنا هذا وما كنا له مقرنين، وانا الى ربنا لمنقلبون ﴾**. ثم قال: الحمد لله (ثلاثا)، و الله اكبر (ثلاثا )، سبحانك اني ظلمت نفسي ، فاغفرلي ، فانه لا يغفر الذنوب الا انت ) . ثم ضحك ، فقلت له : من أي شي ضحكت يا امير المؤمنين ؟ قال : رأيت رسول الله ﴿ﷺ﴾ صنع كما صنعت ، ثم ضحك ،فقلت : من أي شي ضحكت يارسول الله ؟ قـال : (( إنّ ربـك ليعجب من عبده إذا قال: رب اغفرلي ذنوبي، يعلم انه لايغفر الذنوب احد غيره )).** اخرجه ابوداود (٢٦٠٢) و الترمذي (٣٤٤٣) وصححه الترمذي وابن حبان و الحاكم و النووي و غيرهم . انظر تعليق الالباني على الكلم الطيب (١٢٢) .

واتە: عەلی کوری ڕەبیعە دەفەرمویٚ : جارێکیان لە خزمەت ( عەلی )دا بووم (ڕەزای خوای لیٚبێت) وولاغێکیـان بـۆ هێنـا تـا سـواری بێـت، کـاتیٚ قاچـی خسـتە سـەری فـەرموی: ( بسم الله) و کاتیٚ لەسەرپشتی دانیشت فەرمووی( الحمدلله)، پاشان فەرمووی ( پاکی و بیٚگەردی بۆ ئەو خوایەیە کەئەمەی بۆژێر بارو زەلیل خستوین و ئێمە توانامان نەبوو بەسەریدا ، وەئێمە هەر بۆلای پەروەردگارمان دەگەڕێینەوە ) (سورەتی الزخرف / ١٣ ) پاشـان سـیٚجارفەرمووی ( الحمـدلله ) وەسـیٚ جـار فـەرمووی ( الله اکـبر )، ئینجـا فەرمووی:پاکی و بیٚگەردی بۆ تۆ خوایە، من ستەمم لە نەفسی خۆم کردووەو لێم خۆش بە بەڕاستی جگە لە تۆ کەس لە گوناه خۆش نابێت،پاشان پێکەنی . پێم ووت : ئەی پێشەوای ئیمانداران بەچی شتێك پێکەنیت ؟ فەرمووی: پێغەمبەری خوام ﴿ﷺ﴾ بینـی بـە هـەمان شـێوەی کـردوو پێکـەنی منـیش عـەرزم کـرد: ئـەی پێغەمبـەری خـوا بەچـی پێکەنیت ؟ فەرمووی: خوای پەروەردگارت تەعەجوبی لیٚ دێت کاتێك عەبدێکی دەڵێت : پەروەردگار لە گوناهەکانم خۆش بە، کەئەزانی هیچ زاتیٚ لەگوناه خۆش نابیٚ جگە لەو .

## سوعبەتی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾

پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ بە ئەنەسی دەفەرموو: خاوەنی دوو گویٚیەکە[١٣٦]. سـوبعەتی لەگـەڵ منداڵیشـدا دەکـرد [١٣٧] . بـەڵام سـوبعەتەکانی دوور بـووە

(١٣٦) **عن انس بن مالك : أن النبي ﴿ﷺ﴾ قال له: ((ياذا الأُذنَين)). قال أبو أسامة : يعني يمازحه./** اخرجه الترمذي (١٩٩٣) وقال: حديث صحيح غريب . وابوداود و أحمد وغيرهم والطبراني (٦٦٢) من طريق اخرى عن انس به وسنده صحيح .

**واته: پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ بەئەنەسی فەرمووە: ( ئەی خاوەنی دوو گوێیەکە)، ابو ئوسامە دەفەرمووێ: واتە سوعبەتی لەگەڵ کردووە .**

(١٣٧) **عن أنس بن مالك (τ) قال: إن كان رسول الله ﴿ﷺ﴾ ليخالطنا حتى يقول لأخ لي صغير: (( يا أبا عُمَـــير، ما فـعل النُّغَير))** رواه البخاري و مسلم (٢١٥٠) و ابن ماجه والترمذي وغيرهم .

**واتە: پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ تێکەڵاوی دەکردین بەجۆرێ برایەکی بچوکم هەبوو [لەدایکەوە کە کوڕی ابو طەلحەیە دایکی ناوی أم سلیمی کچی ملحانەو أبو عمیر بە منداڵی لەسەردەمی پێغەمبەردا ﴿ﷺ﴾ وەفاتی کرد] سوبعەتی لەگەڵ دەکردو پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ پێی دەفەرموو: ئەی باوکی عومەیر نوغەیرەکە ( کە باڵندەیەکە ) چیکرد .**

**ابو عیسی دەفەرموێ: تێگەیشتنی فەرموودەکەو سوودەکانی ئەوەیەکە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ سوعبەتی دەکرد، وە ئەوەشی لێ وەردەگیرێ کە کونیەی بۆ منداڵ داناوەو پێی فەرمووە: ( ئەی باوکی عومەیر ) . وە هیچی تێدا نی‌یە کە باڵندە بدرێتە منداڵ تا یاری پێبکات. وەبۆیە پێغەمەبەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: ( ئەی باوکی عومەیر نوغەیرەکە چیکرد؟ )چونکە باڵندەیەکی هەبوو یاری پێ دەکردو مردار بۆیەوە، ئیتر ئەو منداڵە خەم باربوو بۆی، پێغەمبەریش ﴿ﷺ﴾ بۆ دڵدانەوەی سوعبەتی لەگەڵ کرد.**

**لە درۆ[(١٣٨)] .وە سوعبەتی لەگەڵ خەڵکیدا کردووە[(١٣٩)] .**

---

(١٣٨) **عن أبي هريرة (رضي الله تعالىعنه)قال: قالوا: يارسول الله ! إنّك تُداعبنا . قال: ((نعم ، غير أني لا أقولُ الا حقاً ))** رواه الترمذي (١٩٩١) وتفرد به و قال : حديث حسن صحيح . و انظر الصحيحة (١٧٢٦) .

واتە: وتیان ئەی پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ تۆش سوبعەتمان لەگەڵ دەکەیت، ئەویش فەرمووی: بەڵێ بەڵام ئەوە هەیە کە من جگە لە ڕاستی هیچی تر ناڵێم .

(١٣٩) لەو سوعبەتانە: **عن انس بن مالك: ان رجلا استحمل رسول الله ﴿ﷺ﴾ فقال: ((اني حاملك على ولد ناقة!)) فقال: يارسول الله ما أصنع بولد الناقة؟ فقال ﴿ﷺ﴾: ((وهل تلد الإبلُ الا النوق؟ )).** اخرجه الترمذي (١٩٩٢) وقال : حديث حسن صحيح غريب ، وابوداود واسناده صحيح على شرط الشيخين ورواه احمد ٣ / ٢٦٧ .

واتە: پیاوێك داوای لە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ کرد کە وڵاغێکی بداتێ تا سواری بێت . ئەویش فەرمووی: من سواری بەچکە وشترت دەکەم، فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا جا من چی بکەم لە بەچکەی ووشتر ؟ پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: ئایا هەموو ووشترێك هەر بەچکەی نابێت ؟

**وعنه: (ان رجلا من اهل البادية كان اسمه زاهرا، وكان يهدي الى النبي ﴿ﷺ﴾هدية من البادية، فيجهزه النبي ﴿ﷺ﴾ اذا اراد ان يخرج ، فقال النبي ﴿ﷺ﴾: (( ان زاهراً باديتُنا ، ونحن حاضروه )) . وكان ﴿ﷺ﴾ يحبه وكان رجلاً دميماً ، فأتاه النبي ﴿ﷺ﴾ يوماً وهو يبيع متاعه ، فاحتضنه من خلفه وهو لايبصره ، فقال: من هذا ؟ أرسلني، فالتفت ، فعرف النبي ﴿ﷺ﴾، فجعل لا يألو ماألصق ظهره بصدر النبي ﴿ﷺ﴾ حين عرفه ، فجعل النبي ﴿ﷺ﴾ يقول: ((من يشتري هذا العبد ؟)) فقال : يا رسول الله ! اذا والله تجدني كاسدا ، فقال النبي ﴿ﷺ﴾: (( لكن عند الله لست بكاسد )) او قال: (( انت عند الله غالٍ)).** اخرجه الترمذي و قال الالباني : اسناده صحيح على شرط الشيخين وكذا قال ابن كثير واخرجه ابن حبان (٢٢٧٦) والبغوي و احمد وصححه الحافظ وله شاهد من حديث زاهر نفسه اخرجه الطبراني في (المعجم الكبير) برقم ( ٥٣١٠ ) .

واتە: پیاوێك هەبوو لە خەڵکی گوندەکانی نزیك شاری مەدینەو ناوی (زاهیر) بوو، دیاری لە گوندەوە دەهێنا بۆ پێغەمبەر﴿ﷺ﴾، وە کاتێ بیویستایە لە شار دەرچێ پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دیاری بۆ ئامادە دەکردو پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ دەیفەرموو : زاهیر لە نزیك مەدینە دەژی‌و دێ نشینی ئێمەیەو لامان دەمێنیتەوەو ئێمەش شارنشینی ئەوین‌و لەناو مەدینەداین بۆ ئەو [ئەمە جوانترین مامەڵەکردنە لەگەڵی ] وە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ خۆشی دەویست لە کاتێکدا ئەو پیاوێکی بە ڕواڵەت و دیمەن ناشرین بوو، ڕۆژێکیان پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ پێی گەیشت لە کاتێکدا ئەو کاڵاو

شمەکی دەفرۆشت و لەدواوە باوەشی پێداکردو ئەو نەیبینی، بۆیە فەرمووی: ئەوە کێیە ؟ بەرم بدە، کە ئاوڕیدایەوە زانی پێغەمبەرە ﴿ﷺ﴾، بۆیە گوێی نەدایەو حەزی دەکرد کە پشتی بەسنگی پێغەمبەرەوە ﴿ﷺ﴾ بێت . پێغەمبەریش ﴿ﷺ﴾ دەیفەرموو: کێ ئەم بەندەیەم لێ دەکڕێ ؟ فەرمووی: ئەی پێغمبەری خوا سوێند بە خوا من کەساس و هەرزان دەکەوم .پێغەمبەریش ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: بەڵام تۆ لای خوا گەورە هەرزان نیت تۆلای خوای گەورە بە نرخ و گرانبەهایت .

**عن الحسن قال : اتت عجوز الى النبي ﴿ﷺ﴾ فقالت: يارسول الله: ادع الله ان يدخلني الجنة. فقال: (( يا أمَّ فلان ! ان الجنة لا تدخلها عجوز )) . قال : فولت تبكي فقال: ((أخبروها انها لا تدخلها وهي عجوز، ان الله تعالى يقول ﴿ انا انشأناهن انشاءا فجعلناهن أبكاراً. عربا اترابا ﴾.** رواه الترمذي وحسنه الالباني في ( غاية المرام في تخرج احاديث الحلال والحرام ) رقم (٣٧٥) لشاهد له خرجته ثمة . انظر المقدمة منه ص (١١) .

واتە: پیرێژنێك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ و فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا: لەخوای گەورە بۆم بپارێرەوە کە بمخاتە بەهەشت . ئەویش فەمووی: ئەی دایکی فلان ! بەڕاستی بەهەشت پیرێژنی تێ ناچێت . دەفەرموێ: ئەویش بە گریانەوە پشتی هەڵکردو ڕۆیشت . پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾فەرمووی: هەواڵی بدەنێ کەئەو بەپیری ناچێتە بەهەشتەوە . خوای گەورە دەفەرموێت: ئێمە سەر لە نوێ دروست و ئامادەمان کردونەتەوە بەعازەبیو خۆشەویستن لەلای مێردەکانیان و هاوتەمەنن لەگەڵیاندا (سورەتی الواقعة ئایەتی٣٥–٣٧).

## شیعر ووتنی

هەندێك جار لە هۆنراوەکانی عبداللەی کوڕی ڕەواحەی دەفەرموو(١٤٠)، یان لەوانەی لوبەید(١٤١) .

---

(١٤٠ ) **عن عائشة (رضي‌الله عنها)قالت: قيل لها: هل كان رسول الله ﴿ﷺ﴾ يتمثل بشيء من الشعر؟ قالت: ( كان يتمثل بشعر ابن رواحة، ويتمثل بقوله: ويأتيك بالاخبار من لم تزود )** اخرجه الترمذي (٢٨٥٢) وقال : حديث حسن صحيح انظر الصحيحة (٢٠٥٧) .

واتە: لە عائیشەوە دەفەرمووێ کەوا پرسیاری لىٚکرا: ئایا پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ هیچ شیعرێکی دەوتەوە ؟ فەرمووی: هەندێ جار شیعری ابن رواحەی دەوتەوە [کەناوی عبدالله ی کوری رەواحەی ئەنصاری خەزرەجیـیە یەکێکە لە نەقیبەکان و بەشداری عەقەبەو بەدرو ئوحودو خەندەق و ئەوانی تری کردووە جگە لە فەتح وجەنگەکانی دواتر،چونکە لەڕۆژی (مؤتە) دا بە ئەمیری شەهید کرا . شیعری زۆرە لەوانە :

وفينا رسـول الله يتـلو كتـابه ... اذا انشق معروف من الفجر ساطع
أرانا الهدى بعد العمى فقلوبنا ... به موقنـات ان مـا قـال واقـع
يبيت يـجافي جنبه عن فراشه ... اذا استقلت بالكافرين المضاجع ]

هەروەهاشیعری ئەویشی دەوت [کە مەبەست پـێی طـرفـەی کـوڕی العبـد] کە دەفەرموێت:

ستبدي لك الايام ما كنت جاهلا ... ويأتيك بالاخبـار من لم تـزود

واتە: ئەو ڕۆژانە ڕوون دەبێتەوە کە تۆ نەشارەزا بویت و هەواڵی ئەوەش دێت کە تۆ تێشوت نەداوەتێ .

(١٤١) **عن أبي هريرة (τ)قال: قال رسول الله ﴿ﷺ﴾: ((ان اصدق كلمة قالها شاعرٌ، (وفي رواية: اشعر كلمة تكلمت بها العرب / ٢٤٧ ) كلمة لبيد: الا كل ماخلا الله باطل، وكاد امية بـن أبي الصلت أن يسلم ))** رواه البخاري و مسلم (٢٢٥٦) والترمذي وابن ماجه و الرواية الاخرى فيها شريك بن عبدالله القاضي وهو سيئ الحفظ وهي رواية لاحمد ايضا : ولم يصح ان تمام البيت ( وكل نعيم لا محالة زائل ) لان فيه من لم يسم . راجع ( فتح الباري ) .

واتە: ڕاست ترین ووتە کە شاعیر وتبێتی ( یان شیعر ترین وجوانترین ووتە کە لەناو عەرەبدا وترابێ ). ووتەکەی لوبەیدە [کە ناوی لوبەیدی کوری ابی ربیعە العامریـیەو بە وەفد لەگەڵ قەومەکەی دا هاتنە خزمەت پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ و لە نەفامی و ئیسلامیشدا کەسێکی بەڕێز بووەوچۆتە کوفە، لە تەمەنی (١٤٠)ساڵی داو لە ساڵی (٤١کۆچی) وەفاتی کردوەو لە کەسە زوبان پاراو و شاعیرەکانی عەرەبەو کاتێ موسڵمان بوو وازی لە شیعر ووتن هێناو فەرمووی (یکفینی القرآن) قورئانم بەسە] کە فەرمووی: هەموو شتێك جگە لەیادی خوای پەروەردگار بەتاڵە، بە جۆرێ خەریك بوو ( ئومەییەی کوڕی أبی الصلت ) بەهۆی ئەمەوە موسڵمان ببێت.

وە هەندێك جار خۆشی شیعری فەرمووە (١٤٢) ، وەك لە ڕۆژی (حونەین )دا فەرموویەتی (١٤٣) وەهانی شاعیرەکانیشی دەدا بۆ ووتنی شیعری جوان (١٤٤)

---

(١٤٢) **عن جُندُب بن سفيان البجلي قال: أصاب حجر اصبع رسولِ الله ﴿ﷺ﴾ فَدَمِيَت فقال: (( هل أنت إلا إصبع دَميتِ وفي سبيل الله ما لقيتِ)).** اخرجه البخارى ومسلم (١٧٩٦) وغيرهم،.

واتــە: بــەردێك بــەر پەنجــەی پێغەمبــەر ﴿ﷺ﴾ كــەوت و خــوێنی لــێ هێنــا، ئــەویش فەرمووی: ئایا تۆ هەرپەنجەیەك نیت وخوێنت لـێ دێت ولە پێناوی خوای گەورەدا ئاوات لێهات یان لە پیناوی خوای گەورەدا چیت بەسەر هاتووە .

(١٤٣) **عن البراء بن عازب قال: قال له رجل: أفررتم عن رسول الله ﴿ﷺ﴾ يا أبا عُمارة ؟ فقال: لا والله ، ما ولّى رسول الله ﴿ﷺ﴾ ولكن ولّى سرعانُ النـاس ، تلقـتهم هـوازن بالنبـل ، ورسول الله ﴿ﷺ﴾ على بغلتهِ ، وابو سوفيان بن الحارث بن عبد المطلب آخذِ بلجامها و رسـول الله ﴿ﷺ﴾ يقول: (( انا النبيُّ لا كذب أنـا ابـن عبـد المطلب ))** اخرجه مسلم (١٧٧٦) والبخاري (١٦٨٨) وابن ماجه واحمد الترمذي .

واتـە: لـە بـەرائی كـوڕی عازەبـەوە دەفـەرموێت پیاوێـك لێـی پرسـی: ئایـا ئـەی بـاوكی عومـارە ئێـوە لـە دەوری پێغەمبـەری خـوا ﴿ﷺ﴾ هـەڵهاتن و ڕاتـان كـرد؟ فـەرمووی: نـە سـوێند بـە خـوا پێغەمبـەری خـوا ﴿ﷺ﴾ پشـتی هەڵنـەكرد، بـەڵكو ئەوانـەی لـە پێشـەوە دەرچوون وئەوانـەی كەترسـان هـەڵهاتن، هـەوازن [كە بە تیر ئەنـدازو دەسـت راسـتی بـە ناوبانگ بوون وبە دەگمـەن نیشـانەیان هەڵـە دەكرد] شوێنیان كـەوتن بـەتیرو پێغەمبـەری خواش ﴿ﷺ﴾ بەسەر ووڵاغەكەیەوە بوو ئەبوسوفیانی كوڕی حارثی كوڕی عبد المطلب [ كـە ئـامۆزاو بـرای شـیری پێغەمبـەر ﴿ﷺ﴾ بـوو] جڵەوەكـەی گرتبـوو پێغەمبـەریش ﴿ﷺ﴾دەیفەرموو : من پێغەمبەرم و درۆنیم .من لە نەوەو كوڕانی عبد المطلبم .

(١٤٤) **عن انس: أن النبي ﴿ﷺ﴾ دخل مكة في عُمرة القضاء ، وابن رواحة يَمشي بين يديه وهو يقول :**

**خَلّوا بني الكفار عَن سبيله اليومَ نَضربْكُم على تنــزيله**

**ضَرْباً يُزيلُ الهام عن مقيلهِ و يُذهــِلُ الخليل عن خليله**

**فقال له عمر : يا ابن رواحة ! بين يَدَيْ رسولِ الله ﴿ﷺ﴾، وفي حرم الله تقول الشعر ؟ فقال ﴿ﷺ﴾: (( خل عنه يا عمر ! فلهي أسرعُ فيهم من نضح النَّبل )).** اخرجه الترمذي (٢٨٥١) وقال : حديث حسن صحيح غريب و النسائي وابن حبان في صحيحه (٢٠٢٠) واسنادهم صحيح على شرط مسلم .

واتە:پێغەمبـەری خـوا ﴿ﷺ﴾ لـە عـومرەی قەزائیدا [كـەدوای سـوڵحی حودەیبیـە بـوو ] چووە نـاو شـاری مەككـەوە ، عبـدالله ی كوڕی ڕەواحـەش لەبەردەمی‌یـەوە دەڕۆیشـت وبـە شیعر ووتنەوە دەیفەرموو: ئەی نەوەكانی كوفر لاچن لەسەر ڕێگـاو بەردەمی‌یـەوە، ئـەمڕۆ

ئێمە بەپێی قورئان و وەحی خوایی لێتان دەدەین، لێدانێك كە تەپڵی سەر لە جێگەكەی بپەڕێنێو خۆشەویست لە خۆشەویست جیابكاتەوە.

عومەر فەرمووی: ئەی كوڕەكەی ڕەواحە! ئەوە لەبەردەمی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و لە ناو حەرەمی خوای گەورەدا شیعر دەڵێییت؟!

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: وازی لێ بێنە عومەر! ئەو شیعرەی ئەم زۆر لە هاویشتنی تیر خێراترە بۆ سەر دڵی ئەوان.

**وعن عمرو بن الشّريد عن ابيه قال : كنت رديف النبي (ﷺ) ، فأنشدته مائة قافية من قول امية بن ابي الصلت الثقفي ، كلّما أنشدته بيتاً قال لي النبي (ﷺ): (( هِيهِ )) حتى أنشدته مائة . يعني بيتا. فقال النبي (ﷺ): (( إن كاد ليُسلم))،** اخرجه مسلم (٢٢٥٥) وابن ماجه و احمد .

واتە: من لەپشتی پێغەمبەرەوە (ﷺ)سواری وڵاغێك بوو بووین و سەد بەیت شیعرم لە شیعرەكانی ئومەیەی كوڕی ابی الصلت بۆ ووت، هەرجارێك بەیتێكم بۆ دەوت پێی دەفەرمووم: زیاترم بۆ بڵێ، تا سەد بەیتی تەواوم ووت، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: خەریك بوو موسوڵمان ببێت .

**وعن عائشة قالت: كان رسول الله (ﷺ) يضع لحسان بن ثابت منبرا في المسجد يقوم عليه قائما ، يفاخر عن رسول الله (ﷺ). او قال: ينافح عن رسول الله (ﷺ) ويقول :(( ان الله تعالى يؤيد حسان بروح القدس ما ينافح او يفاخر عن رسول الله (ﷺ)))** اخرجه الترمذي (٢٨٤٩) وابوداود (٥٠١٥) و احمد وغيره وصححه الترمذي والحاكم والذهبي وهو مخرج في الصحيحة (١٦٥٧) .

واتە:پێغەمبەری خوا (ﷺ) مینبەرێكی لە ناو مزگەوتدا دادەنا بۆ حەسانی كوڕی ثابت(ڕەزای خوای لێ بێت) تا شانازی دەربڕێ بە پێغەمبەرەوە (ﷺ) و وەسفی بكات. وە دەیفەرموو: خوای گەورە پشتگیری حەسسان دەكات بە جبریل كەوا چۆن شانازیو وەسفی پێغەمبەریخوا(ﷺ) دەكات.

وە لە ڕۆژی خەندەقیش دا شیعری دەوت لەگەڵ هاوەڵەكانیدا تا كەمێك ماندویەتیان بڕەوێتەوە(١٤٥) . وە كاتێ شیعری شەرعیان دەوت بێ دەنگ دەبوو(١٤٦) .

---

(١٤٥) لە بەرائەوە دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە ڕۆژی خەندەقدا گڵی دەگواستەوە، بەجۆرێ سەر سكی پیرۆزی تۆزاوی بوو بوو. دەیفەرموو:

**والله لو لا الله ماهتدينا ولاتصدقنا ، ولا صلينا**

**فــانزلن سكــينة عليــنـا          وثبت الأقدام إن لاقينا**
**والمشـركون قد بَغَوا علينا          اذا ارادوا فتــنــة أبيــنـا**

**وه دهنگی بهرز دهكردهوهو دهیفهرموو:** (( **أبينا      أبينا** )) . متفق عليه

**واته: سوێند بهخوا ئهگهر خوای گهوره ویستی نهبوایه هیدایهت نهدهدراینو خێرو چاكهو نوێژیشمان نهدهكرد . ساخوایه سهكینهت و دڵ ئارامیمان بهسهردا بباریێنهو قاچهكانمان ڕاوهستاوو چهسپاو بكه كاتیٚ دهگهین به دوژمن. چونكه موشریكهكان ستهم و ناڕهوایمان بهسهردا دهكهن و ئهگهر مهبهستیان ئهوهبیٚ توشی گومرایی و شیرك و فیتنهمان بكهن بههیچ جۆریٚ مل نادهین.**

**وه لـه ئهنهســهوه دهفـهرموویٚ: موهـاجیرو ئهنصـارهكان خـهریكی ههڵكهنـدنی خهندهق بوون و گڵیان دهگواستهوهو دهیانوت:**

**نحن الذين بايعوا محمداً          على الجهاد ما بقينا أبداً .**

**واته: ئێمه ئهوانهین بهیعهتمان داوه به محمد ﴿ﷺ﴾، لهسهر جیهادكردن ههتا ههتایه تا بمێنین. پێغهمبهری خواش ﴿ﷺ﴾ وهڵامی دهدانهوهو دهیفهرموو:**

**اللهم لا عيش إلا عيشُ الاخرة          فاغفــر للانصــار و المهاجرة** ( متفق عليه )

.

**واتـه: خوایـه هـیچ ژیانێـك نیـیه جگـه لـه ژیـانی ڕۆژی دوایـی. ساخوایه لـه ئهنصارو موهاجیرهكان خۆش ببه .**

(١٤٦) **عن جابر بن سمرة قال: (جالست النبي ﴿ﷺ﴾ أكثر من مائةَ مرة، وكـان أصحابُه يتناشدون الشعر، ويتذاكرون اشياء من امر الجاهلية وهو ساكت، وربما تبسَّم معهم )**

• اخرجه الترمذي (٢٨٥٤) وقال : حديث حسن صحيح . واحمد وصححه الالباني .

**واته: جابری كوڕی سهمره دهفهرمویێت : لهخزمهت پێغهمبهردا ﴿ﷺ﴾ زیاد له سهد جار دانیشتوم . وه هاوهڵهكانی شیعریان دهوتو باسی سهردهمی نهفامیێتیان دهكرد كهههندیٚ شتی ئهوكاتهیان باس دهكردو ئهویش بیٚ دهنگ بوو ، یاخود لهوه دهچیٚ زهردهخهنهشی كردبیٚ لهگهڵیان .**

## فهرموودهكهی امّ زَرع

**پێغهمبهری خوا ﴿ﷺ﴾ دهیفهرموو: من بۆ تۆ (ئهی عائیشه ) وهك ئهبو زهرع وام** (١٤٧)

(١٤٧) عن عائشة قالت : جلَست احدى عشرة امرأة فتعاهدن وتعاقدنَ أن لايكتمن من أخبار ازواجهن شيئا .

( فقالت الاولى ) : زوجي لحمُ جَمَلٍ غُثّ . على رأس جبلٍ وعر، لا سهل فيرتقى ، ولاسمين فينتقل .

( قالت الثانية ) : زوجي لا اثير خبره ، اني اخاف أن لا أذَرَه ، إن أذكره أذكر عُجرَه و بُجرَه .

(قالت الثالثة ) : زوجي العَشَنّق ، ان أنطِق أطلّق ، وان اسكُت اعلّق .

( قالت الرابعة ) : زوجي كَلَيل ( تهامة ) ، لا حرَّ ولا قرَّ ، ولا مخافة ولا سآمة .

( قالت الخامسة ) : زوجي ان دخل فهد ، وان خرج أسد ، ولا يسأل عما عهد .

( قالت السادسة ): زوجي ان اكل لفَّ ، وان شرب اشتفَّ ، وان اضطجع التَفَّ . ولا يُولجُ الكفَّ لِيَعلم البثَّ .

( قالت السابعة ) : زوجي عَياياءُ ، ( او غياياءُ ) طباقاء ، كلُّ داءٍ له داء ، شجَّك ، او فلَّك أو جمع كلاً لك .

( قالت الثامنة ) : زوجي المسُّ ، مسُّ أرنب ، والريح ريحُ زَرنَب .

( قالت التاسعة ) : زوجي رفيع العماد ، طويل النجاد ، عظيم الرماد ، قريب البيت من الناد .

( قالت العاشرة ) : زوجي مالك ، وما مالك ؟ مالك خير من ذلك ، لـه ابـل كـثيرات المبـارك ، قليلات المسارح ، إذا سمعن صوتَ المزهر ايقن انهن هوالك .

( قالت الحادية عشرة ) : زوجي أبو زرع ، وما أبو زرع ؟ أناس من حليّ اذنيّ . وملأ من شَحم عَضدَي ، وبَّجَحني فبجحتْ إلي نفسي ، وجدني في أهل غنيمة بشق ، فجعلني في اهل صهيل واطيط و دائس ومنق ، فعنده اقول فلا اقبح ، وارقد فاتصبح ، فاتقمح ،

أم أبي زرع ، فما أم ابي زرع ؟ : عكومها رداح ، وبيتها فساح ،

ابن ابي زرع ، فما ابن ابي زرع ؟ : مضجعه كمسلّ شطبةٍ ، وتشبعه ذراع الجَفرة ،

بنت أبي زرع ، فما بنت أبي زرع ؟ طوع أبيها ، وطوع أمها . وملء كسائها ، وغيظ جارتها .

جارية أبي زرع ، فما جارية أبي زرع ؟ لاتبثّ حديثنا تبثيثا ، ولا تنقث ميرتنا تنقيثا ، ولا تملأ بيتنا تعشيشا ، قالت: خرج أبو زرع و الأوطاب تُمخَض ، فلقي امرأة معها ولدان لها كالفهدين يلعبان من تحت خصرها برمانتين ، فطلقني ونكحها ، فنكحت بعده رجلا سرّياً ، ركب شريا ، واخذ خطيا ، و أراح (أو راح) علي نعما ثريا ، واعطاني من كل رائحة زوجا ، وقال : كلي أمُ زرع ! وميري اهلك . فلو جمعت كل شي اعطانيه مابلغ أصغر آنية أبي زرع .

**قالت عائشة ( رضيالله عنها ): فقال لي رسول الله ﴿ﷺ﴾: (( كنتُ لك كأبي زرع لأم زرع ))** • اخرجه البخاري ومسلم (٢٤٤٨) والنسائي وفيه زيادة : **((إلا أنه طلقها، و أنا لا أطلّق )) ، فقالت عائشة : يارسول الله بل أنت خير من أبي زرع )** انظر القسطلاني على البخاري ١٠٢/٨ .

**واتــه: يــانزه ژن دانيشــتن پێكــهوهو پــهيمانيان دا بهيــهكتر كــه كهســيان هــهواڵی مێردهكانيان نهشارنهوه له يهكتری و باسی بكهن:**

***(يهكـهميان ووتــی):*** **مێردهكـهی مـن وهكـو گۆشـتی ووشـتر پـيرو بێتامـه، وهك لهسـهر شاخێكی بهرزبێ لێم دووره پهرێزه، نه ئاسانه خۆ بهيته پاڵی[ ئهوهنده ڕهزيل و چروكه ] وه نهقهڵهوه خهڵكی بيبهنهوه ماڵهوه بۆ نان خواردن [لهبهر بێ ڕێزیيهكهی ].**

***( دووهم ووتــی ):*** **مێردهكهی من باسی ههواڵهكهيتان بۆ ناكهم، من ئهترسم كه باسی بكهمو تهڵاقم بدات، يان ئهترسم دهست بكهم به وهسفیو تهواوی نهكهم ئهمهنده خراپهی زۆره . ئهگهر باسی بكهم ئهبێ باسی سهرتاپا خراپهی بكهم و ئهترسم بههۆيهوه لهيهك جيا ببينهوهو ماڵو منداڵم لهكيس بچێت و لێ تێك بچێت .**

***( سێيهم ووتــی ):*** **مێردهكـهی مـن زۆر درێـژو نـابووتو ڕهوشـت خراپـه، ئهگـهر باسـی عهيبهكانيتان بۆ بكهم ئهوهنده خراپه تهڵاقم دهداتو ئهگهر باسی نهكهم و بێ دهنگ بم ئهوا به ههڵواسراوی دهمێنمهوه، نه وهك ژنـی خـهڵكی سـوود پـێ گهيـهنراوم، وه نـه تـهڵاق دراوو سهربهستم تا شووبكهمهوه .**

***( چـوارهم ووتــی ):*** **مێردهكـهم وهكـو شـهوی مهككـهو چـواردهوری وايـه لـه نـهرمو مامناوهنـدیو چـاكیدا، گـهرمو وهڕسـكهر نیيـه، ژيـان بهسـهر بـردن لهگـهڵی هـهمووی خۆشیو لهزهته، نات ترسێنیو نارهحهتت ناكات .**

***( پێنجـهم ووتــی ):*** **مێردهكـهی مـن كـه دێتـهوه ماڵـهوه وهكـو پڵـنگ وايـه لـه پهلاماریدا بۆجيماع كردن ] . وه كه دهردهچێته دهرهوه لهگهڵ خهڵكیدا وهك شێر وايه . وهپرسياری حاڵی خواردنو خواردنهوهی ماڵهوهی ناكات كهدهيزانێ [ واته له ماڵهوه بهڕێزهو نهرمه، له دهرهوهش ئازاو بههێزهو سهخیيهو پرسياری ئهو ماڵهی ناكات كهديار نامێنێ].**

***( شهشـهم ووتــی ):*** **مێردهكـهم كـه نـان دهخـوات هـهموو جۆرێـك تێكـهڵ دهكـاتو زۆر خۆرهوكـه ئـاويش دهخواتـهوه لووشـی دهدات و چـۆڕ بـڕی دهكـات . كـه ڕادهكشـێ خـۆی دهپێچێ له كراسهكهيهوهو لهسوچێكدا خۆی گرمۆڵه دهكات [واتـه تـوخنی ئـهم ناكـهوێت وخۆی تێ ناگهيهنێ]. وه دهست ناكات بهناو ژێر پێخهفو پۆشاكمدا تا بزانيت خـهم و خهفهتم چیيه .**

***( حەوتـــەم ووتـــی ):*** مێردەکـــەم بـــێ دەســـەڵات و دەستەوســـانە، هەڵناســـێ بـــەجێ بەجێکردنی پێویستیەکانم و گەمژەیە و ئاگای بەحاڵم نیە، هەموو عەیبێکی هەیە، یان سەرت دەشکێنێ یان قۆڵێ و ئازات دەشکێنێ ،یان هەردووکی دەکات .

***( هەشتەم ووتـی ):*** مێردەکەم کەدەستم بۆ دەبات وەك کەروێشك وایە [ نەرم و شل و ناسکە ] وە بۆنیشی وەك بۆنی( زەرنەب ) خۆشە [کەرووەکێکی بۆن خۆشە، واتە نەرم و نیان و بەڕەوشتە و بۆنی لاشەو جل و بەرگی خۆشە. یان مەبەست وەسفی چاکە کردنێتی ].

***( نۆیـەم ووتـی ):*** مێردەکـەم شـان و شـەوکەت و ناوبـانگی بـەرزەو قایشـی شمشـێر هەڵگرەکەی درێژەو خاوەنی شمشێرو ئازایەتیە، وەخۆڵەمێشی زۆرەو هەردەم میوانی هەیەو خواردن لە ماڵیدا دەدرێ بەمیوان ئەوەندە سەخیە، وەماڵەکەی نزیکە لەنادی و شوێنی کۆبونەوەی پیاو ماقوڵان لەبەر میوانداری کردنی خەڵکی .

***( دەیـەم ووتـی ):*** مێردەکەم ناوی مالیکە، چ مالیکێك؟ لەوە چاکترە کە بۆتان باس دەکەم لە بەر لێبوردن و ڕێزی. وشترێکی زۆری هەیە لە تەویلەدا، کەمیوان دێت کەم دەبنەوە یان لەلایەکی ماڵەکەدا دایدەنێ بۆ ئەوەی ئامادەبێ بۆ میوان. ئەو ووشترانەی کە گوێیان لە دەنگی ئاسن دەبێت دڵنیا دەبن کە سەردەبڕێن بۆ میوان [ ئەوەندە سەخی و نان بدەیە ] .

***( یانزەیەم ووتی ):*** مێردەکەی من ئەبو زەرعە[ لەبەر زۆری کشتو کاڵ وزەرعاتەکانی یـان پێدەچـێ بـۆ گەشـبینی زۆر منـداڵ وتبێتـی] چ ئـەبو زەرعێـك ؟ هـەردوو گـوێم دەلەرێتـەوە ئەوەنـدەی ئـاڵتون پێـوەکردوە ، گۆشـتی ئێسـقانەکانی پڕکـردووم و قەڵـەوی کردووم و دڵخۆشی کردووم و هەردەم دڵ خۆشم ، منی لەناو ماڵێکی کەم دەستی کەم مەڕو ماڵات و کەم بژێویدا دۆزیەوەو مارەی کردم. خستمیە ناو ماڵێکی پڕ لە دەنگی ئەسپ و دەنگی ووشترو پڕ لە مانگای گێرە کەرو پڕ لە دانەوێڵەی پاك و خۆش . لەلایدا قسەدەکەم و قسەی ناشرینم دەرحەق ناکات [لەبەر جوان ڕەفتاری و چاك گوفتاری]. وەدەنـووم و بـەیانیم بەسـەردا دێـت و بەخەبـەرم ناهێنێتـەوەو لەخـەوم ڕاناپـەڕێنێ بـۆ خزمەتی خۆی .بە دڵی خۆم تێر ئاو دەنۆشم [کە ئەمانە لای غەیری ئەو کەمە ] .

وە دایکی ئەبی زەرع ، چ ژنێکە دایکی ئەبی زرع؟ (واتە دایکی مێردەکەی )مەنجەڵ و قابلەمەکانی گەورەو قورسە و ماڵەکەی فراوان و دەوڵەمەندە .

وە کوڕەکـەی ئـەبی زرع ، چ کوڕێکـە کوڕەکـەی ئـەبی زەرع؟ شـوێنی ڕاکشـانو پـاڵ کەوتنەکـەی جیێ لەتـە گـەڵای دارخورمایـە [ئەوەنـدە کـەم گۆشـتو نـاو قـەد باریکو رۆح سوکە] وە قۆڵی بزنێکی مێینەش تێری دەکات [ئەوەندە بەڕێزو بە قەناعەتە].

وەکچەکەی ابی زرع ، چ کچێکە کچەکەی ابی زرع ؟ گوێڕایەڵی باوكو دایكێتی . لاشەی پـڕو زۆر گۆشـتە پـڕ بـە کراسـەکەی ، ڕق هەسـتێنیێ دراوسـێکەیەتی [ ئەمەنـدە جـوانو سەلارە کچە دراوسیێ بەخیلی پیێ دەبات ].

خزمەتکارەکەی ئەبی زرع . چ کچێکە ئەو خزمەتکارە ؟ قسـەی ماڵمـان بڵاو ناکاتـەوەو نایباتە دەرەوە . وەخواردنی ماڵمان نادزیێ بۆ دەرەوە [ ئەوەندە ئەمین و دەست پاکە ] . ماڵەکەمان پیسو پڕژو بڵاو ناکاتـەوە وەك لانـەی باڵنـدە، بـەڵکو پـاکی دەکاتـەوەو گسـکی دەدات .

ئینجـا دەڵێـت: ڕۆژێکیـان ئـەبوو زەرع دەرچـوو بـۆ سـەفەر لەکاتێکـدا کاسـەکان جمـەی دەهات لە شیرو حاڵمان باش بوو. گەشت بەئافرەتێك دوو کوڕی پـیێ بـوو وەك دوو پڵـنگ لەژێر پۆشاکەکەیەوە یاریيان دەکرد بە هـەردوو مـەمکی دایکیـان (کـە بـە هـەنار وەسـفی دەکات) ئەوکاتە منی تەڵاق داو ئەوی مارە کرد. منیش دوای ئەو شووم کرد بە پیـاوێکی بـەناوبانگو پیـاو مـاقولێ، سـواری ئەسـپێکی چـاك ئـەبوو لەڕۆیشـتندا سـوار چـاك بـوو . ڕمێکی ( خەطی ) هەڵدەگرت [کە (خەطی) دیێیەکە لـە کـەناری ڕووبـاری عومـان ڕمـی لیێ دروسـت ئـەکریێ ]. وەلـە دوانیوەڕۆیەکـدا مـەڕو مـاڵاتو سـامانێکی زۆری پیێـدام . وەلـە هەموو ئاژەڵێکی دامیێ[کەبگەڕێتەوە لەدوای نیوەڕۆ ]دوو دوو لە نێرومیێ، وەپێمـی ووت: بخـۆ ئـەی ئـوم زەرع! وەلیێـی بـدە بەنزیکـەکانو کـەسو کـارت. خـۆ ئەگـەر هـەموو ئـەو شتانەی پیێـی داوم کۆی بکەمـەوە بیخەمـە سـەر یـەك بەلامـەوە ناگاتـە بچوکترین دەفـری ئەبی زەرع [دیارە ئەبی زەرعی پیێ چاکتر بووە].

عائیشـە ( ڕەزای خـوای گـەورەی لیێبێـت ) دەفـەرموێت پێغەمبـەری خـوا ﴿ﷺ﴾ پێـی فەرمووم: (( من بۆتۆ وەکو ئەبی زەرع وام کەچۆن بوو بۆ ئوم زەرع )) . [واتـە لـە چاکەو بەخشیندا نەك لە جیا بونەوەدا ] .

وە لـە ڕیواتەکـەی نەسـائیدا ئـەم زیـادەی لەسـەرە: ((بـەڵام ئـەو تەڵاقیـداو مـن تـەڵاق نـادەم))،عائیشـە فـەرمووی: ئـەی پێغەمبـەریخوا ﴿ﷺ﴾ بـەڵکو تـۆ زۆر لـە ئـەبی زەرع باشتری.

# خەوتنى

پێغەمبەری خوا ﷺ کە دەنوست دەستی ڕاستی دەخستە ژێر ڕوومەتی ڕاستیو دەپاڕایەوە[١٤٨] وەپێش خەوتن ناوی خوای گەورەی دەهێناو سوپاسی دەکرد[١٤٩] ، وەسورەتی ( الإخلاص )و ( الفلق )و ( الناس )ی دەخوێند[١٥٠]

---

(١٤٨) **عن البراء بن عازب : أن النبي ﷺ كان إذا أخذ مضجعه وضع كفَّه اليمنى تحت خَدِّهِ الأيمن وقال: (( ربِّ قني عذابك يوم تَبعثُ ( وفي رواية : تَجمَعُ ) عبادك )).** اخرجه الترمذي (٣٣٩٦) وقال : حديث حسن غريب من هذا الوجه . وصححه الالباني ( الصحيحه ) (٢٧٠٣) .

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ دەچووە سەرجێگای نووستن لەپی دەستی ڕاستی دەخستە ژێر ڕوومەتی راستیو دەیفەرموو: پەروەردگار لە سزای خۆت بمپارێزە لەو ڕۆژەدا کە بەندەکانت زیندوو کۆدەکەیتەوە .

(١٤٩) **عن حذيفه قال: كان النبي ﷺ إذا أوى إلى فراشه قال: (( اللهم باسمك أموت و أحيا ))** اخرجه البخاري وابوداود و الترمذي (٣٤١٣).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ کە دەچووە ناو جێگەی نوستنی دەیفەرموو : خوایە بەناوی تۆوە دەمرم و دەژیم .

**وعن أنس بن مالك : أن رسول الله ﷺ كان اذا أوى الى فراشه قال: (( الحمد لله الذي اطعمنا وسقانا ، وكفانا و آوانا ، فكم ممن لا كافيَ له ولا مُؤوي ))** . اخرجه مسلم وابو داود (٥٠٥٣) والترمذي (٣٣٩٣) والنسائي .

واتە: کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ دەچووە ناو پێخەفی نوستنی دەیفەرموو: سوپاسو ستایش بۆ ئەو خوایەی کە خواردنو خواردنەوەی داینێو بێ نیازی کردینو لانەی داینێ، چەندان کەس هەن کەخوا بەبەس نازانن و بێ جێو بێ لانەن .

(١٥٠) **عن عائشة قالت: كان رسول الله ﷺ إذا أوى الى فراشه كلَّ ليةٍ جمع كفيه فنفث فيهما، وقرأ فيهما (قل هو الله احد) و (قل اعوذ برب الفلق ) و (قل اعوذ برب الناس) ثم مسح بهما ما استطاع من جسده ، يبدأ بهما رأسَهُ و وجهَه ، وما أقبل من جسِده ، يصنع ذلك ثلاث مرات )** اخرجه البخاري ومسلم وابو داود (٥٠٥٦) والترمذي (٣٣٩٩) .

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو شەوێك کە دەچووە سەر جێگای نوستنی هەردوو لەپی دەستی دەدا لەیەكو فوی پێدا دەکردنو سورەتی (الاخلاص ) و ( الفلق ) و ( الناس )ی پێدا دەخوێندنو پاشان دەستی دەهێنا بەسەر ئەو شوێنەی لەشی کە بیتوانیایەو لە سەرو دەمو چاوو پێشەوەی لاشەیەوە دەستی پێدەکردو، ئەمەشی سێبارە دەکردەوە .

به شەو لەسەر لای ڕاست دەخەوت و پێش نوێژی بەیانیان قۆڵی ڕاستی دادەچەقاندو سەری دەخستە سەر لەپی دەستی ڕاستی[(١٥١)] . سەرەتای شەو دەنوست و کۆتایی‌یەکەی بەخواپەرستی زیندوو دەکردووە[(١٥٢)] .

## شێوازی پەرستش و نوێژی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾

کە گوێی لە خوێندنی کەڵەشێر دەبوو هەڵدەستا بۆ شەو نوێژ[(١٥٣)]، هەندێ جار بە نەعلەوە نوێژی کردووە[(١٥٤)] . لەکاتی زۆر خەفەت و ناڕەحەتی‌دا نوێژی دەکرد[(١٥٥)] وە فەرموویەتی :

---

(١٥١) **عن ابي قتادة: ( أن النبي ﴿ﷺ﴾ كان إذا عرَّس بليلٍ اضطجعَ على شِقِّهِ الأيمن ، و إذا عرّس قبيل الصبح نصب ذراعه ، ووضع رأسه على كفه )** اخرجه سلم (٣١٣) وغيره .

واتە: پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ ئەگەر بەشەو دابەزیایە ئەوا لەسەر لای ڕاستی ڕادەکشاو دەنوست . وەئەگەر لە پێش بەیانی‌دا دابەزیایە قۆڵی دادەچەقاند سەری پیرۆزی دەخستە سەر لەپی دەستی [ئەمەش لەبەر نوێژی بەیانی بۆ ئەوەی لەکیسی نەچێت کە ئەمە فێرکردنێکیشە بۆ ئێمە ].

(١٥٢) **(كان ينام أول الليل ، ويُحيي آخره)** متفق عليه .

واتە: سەرەتای شەو دەنوست و کۆتایی‌یەکەی بە خواپەرستی زیندوو دەکردەوە .

(١٥٣) **( كان يقوم إذا سمع الصارخ ) ( يعني الديك )** . متفق عليه

واتە: پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ ئەگەر گوێی لە خوێندنی کەڵەشێر بووایە لەخەو هەڵدەستا بۆ شەو نوێژ .

(١٥٤) **( كان يصلي في نعليه )** متفق عليه .

واتە: پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بە جووتە نەعلەکەیەوە نوێژی دەکرد .

(١٥٥) **(كان اذا حزبه امر صلى)** حديث حسن رواه احمد وابوداود .

واتە: پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ئەگەر ناڕەحەتی و خەفەت زۆری بۆ بهێنایە نوێژی دەکرد .

وەك مـن نوێـژ بكـەن [١٥٦] پەنجـەی شـایەتمانی لـە تەحیاتـدا دەجوڵانـد وە فەرمویـەتی: لەسـەر شـەیطـان توندتره لـە ئاسـن [١٥٧] .ئەونـدە شـەو نوێـژی دەكـرد قاچـە پیرۆزەكـانی ئاوسـاو قڵیشـان [١٥٨] ، وە سـەرەتایی شـەو

---

(١٥٦) فەرموویەتی: (( **صلوا كما رأيتموني أُصلّي** )) رواه البخاري

واتە: نوێژەكانتان بەو جۆرە بكەن كە من دەبينن دەيكەم .

(١٥٧) **(كان إذا جلس في الصلاة وضع يديه على ركبتيه، و رفع أصبعه اليمنى التي تلي الابهام فدعا بها )** رواه مسلم في صفة الجلوس في الصلاة ٥ / ٨٠

واتە: پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ كە لە نوێژدا دادەنيشت بۆ تەحيات هەردوو دەستی دەخستە سەر هەردوو چۆكی و پەنجەی شايەتمانی تەنيشت پەنجە گەورەی دەستی ڕاستی بەرز دەكردەوەو پێی دەپاڕايەوە .

**( كان يحرك اصبعه اليمنى يدعو بها )** صحيح رواه النسائي

واتە: پەنجەی شايەتمانی دەستی ڕاستی دەجوڵاندەوەو پێی دەپاڕايەوە .

وە دەيفەرموو: **(لهي أشدّ على الشيطان من الحديد ) ( يعني السبابة )**.حديث حسن رواه احمد .

واتـە: ئـەو پەنجەيـە توندتره لەسـەر شـەيطـان لەئاسـن [چـونكە نيشـانەيە بـۆ يەكتاپەرستی ] .

ئيمامی مالك واحمد بن حنبل و هەندێك لە شافعيەكان ( ڕەحمەتی خوايان لێ بێت ) كاريان بە سوننەتی پەنجەی شايەتمان جوڵاندن كردووە لە نوێژدا .وەكو لە ( شرح المهذب )ی النووی ٣/٤٥٤ هاتوەو موحەقيقی ( جامع الاصول ) ٥ / ٤٠٤ باسی ئەمەی كردوە .

(١٥٨) **عن المغيرة بن شعبة (τ)قال: صلى رسول الله ﴿ﷺ﴾ حتى انتفخت قدماه، فقيل له: أتتكلف هذا وقد غفر الله لك ما تقدم من ذنبك وما تأخر؟ قال ((أفلا أكون عبداً شكوراً))** أخرجه البخاری ومسلم والترمذی (٤١٢) وقال: حديث حسن صحيح، وابن سعد وابن خزيمة.

واتـە: پێغەمبـەری خـوا﴿ﷺ﴾ ئەوەنـدە شـەونوێژی دەكـرد تـا هـەردوو قاچـی پـيرۆزی ئاوسابوون عـەرزيان كـرد: ئايا ئـەم ئەركـە لەسـەر خـۆت دادەنێيـتو لـە كاتێكدا خـوای گەورە لـە گوناهی پێش‌وپاشت خۆش بووە؟ فەرمووی: ئايا عەبدێكی شوكرانە بژێری خوای گەورە نەبم [ بەتايبەتی لەسەرئەو لەگوناه خۆش بوونەی پێش‌و پاشم ].

**وفي حديث ابي هريرة : ( كان رسول الله ﴿ﷺ﴾ يصلي حتى ترم ( وفي رواية : تنتفخ /٢٦٠) قدماه )** قال الالباني : اسناده حسن صحيح . اخرجه الترمذي وابن خزيمه في صحيحه (١١٨٤) واسناد رواية الاخرى حسن ، والنسائي مختصرا بلفظ ( **كان يصلي حتى تزلع -يعني تشقق - قدماه**) وسنده صحيح .

واتـە: پێغەمبـەری خـوا ﴿ﷺ﴾ ئەونـدە شـەو نوێـژی دەكـرد تـا هـەردوو قاچـی پـيرۆزی ئاوسان، لە ڕيوايەتە كەی تردا: قڵيشان .

دەنوســت و ناوەڕاســتی شــەوو پارشــێو هەڵدەســتا تــا دەچــوو بۆنوێــژی بــەیانی[١٥٩]، وە کــە لەشــەودا هەڵدەســتا (دە) ئایــەتی کۆتــایی ســورەتی (آل عمران)ی دەخوێند[١٦٠] . وە سیانزە ڕکات شەونوێژی دەکرد[١٦١] بەڵام ئەگەر

---

(١٥٩) **عن الاسود بن يزيد قال : سألت عائشة ( رضي الله عنها ) عن صلاة رسول الله ﴿ﷺ﴾ بالليل ؟ فقالت: ( كان ينام اول الليل ثم يقوم ، فاذا كان من السَّحر أوتر ثم أتى فراشه ، فـاذا كان له حاجةٌ ألَمَّ بأهله ، فاذا سمع الاذان وَثَبَ ، فاذا كان جنبا أفاض عليه الماء وإلا توضأ وخرج إلى الصلاة )** اخرجه مسلم (١٢٩) والبخاري ( ٥٩٧ – مختصره ) وسـائر السـتة انمـا رووه مختصـرا جـدا بلفـظ **( كان ينام وهو جنب ولا يمس ماء ) .**

واتـە: ئەسـوەدی کـوڕی یەزیـد دەفـەرموێ: پرسـیارم لـە عائیشـە کـرد دەربـارەی شـەو نوێژی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ئەویش فەرمووی: عادەتی وابوو سەرەتای شەو دەنوست پاشان هەڵدەستاو شەونوێژی دەکرد، کاتێ دەگەیشتە کاتی پارشێو پێش فەجر نوێـژی ویـتری دەکرد[هەندێ جار سێڕکات بەیەك تەحیات و سڵاودانەوە یان یەك ڕکات بەجیا ] پاشان دەهاتـە نـاو جێگاکـەیو ئەگـەر پێویسـتیەکی ( جیمـاع ) کردنـی هەبوایـە دەهاتـە لای خێزانەکـەی . کـاتێ بـانگی [ یەکـەمی ] بـەیانی دەبیسـت ڕادەپـەری و ئەگـەر لەشـی گـران بوایە ئاوی بەخۆدا دەکرد، ئەگەرنا دەست نوێژی دەگرتو لەماڵ دەردەچوو بۆ نوێژ .

(١٦٠) **عن ابن عباس :انه بات عند ميمونة وهي خالته قال: (فاضطجعتُ في عَرض الوسادة، واضطجع رسول الله ﴿ﷺ﴾ في طولها ، فنام رسول الله ﴿ﷺ﴾، حتى إذا انتصف الليل أو قبله بقليل أو بعده بقليل ، فاستيقظ رسول الله ﴿ﷺ﴾ فجعل يمسح النوم عـن وجهـه ، وقـرا العشـر الايات الخواتيم من سورة ( آل عمران )، ثم قام الى شِنٍّ معلّق فتوضأ منها ، فأحسن الوضوء ، ثم قام يصلي ، ( قال عبدالله بن عباس ): فقمت الى جنبه فوضع رسول الله ﴿ﷺ﴾ يـده اليمنـى على رأسي ثم أخذ بأُذني اليمنى ففتلها فصلى ركعتين، ثم ركعتين، ثم ركعتين، ثم ركعتين، ثم ركعتين، ثم ركعتين ( قال معن: ست مرات )، ثم أوتر، ثم اضطجع ( وفي رواية : نام حتى نفخ، وكان إذا نام نَفَخَ / ٢٥٥ ) حتى جاءه المؤذن فقام فصلى ركعتين خفيفتين ثـم خـرج فصـلى الصـبح ) وفي الروايـة الاخـرى: ( فأتـاه بـلال فآذنـه بالصـلاة ، فقـام وصـلى ولم يتوضـأ ).**

اخرجه البخاري ومسلم والترمذي ( ٢٣٢ ) قسما منه وغيره وهو مخرج في الصحيحة ( ١٢٣٧ ) وفي رواية احمد: **(بحذائه)** و سنده صحيح .

**واتە: لە عبداللّهی کوڕی عەباسەوە دەگێڕێتەوە کەوا ئەو شەو لەلای مەیمونەی پوری [خوشکی دایکی لەباوکەوە] ماوەتەوە، دەفەرمووێ: شەو من لەسەر باری پانی دۆشەکەکەدا نوستم و پێغەمبەریش ﴿ﷺ﴾ لەسەر درێژییەکەی ڕاکشاو خەوی پیاکەوت، تا کە نیوە شەو بوو یان پێش نیوە شەو بە تۆزێك یان دوای نیوەشەو بەکەمێك پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بەخەبەر هاتو دەستی دەهێنا بەدەمو چاوی داو خەوەکەی دەسڕی و(دە) ئایەتی کۆتایی سورەتی( آلعمران )ی خوێندەوە ، پاشان هەستا بۆ جەوەنەیەك ئاوی هەڵواسراو[هەڵیان دەواسی تا ئاوەکەی سارد بێت ] کە ئاوی تیا بوو دەست نوێژی لێ گرت بە جوانی و پاشان دەستی کرد بەنوێژ . عبداللّه دەفەرموێ: منیش بەتەنیشتیەوە وەستام . ئەویش دەستی ڕاستی خستە سەر سەرم وگوێچکەی ڕاستی گرتمو ڕایکێشاو دووڕکاتی کرد پاشان دوو ڕکاتی تر پاشان دوو پاشان دوو پاشان دوو ڕکاتی تر( مەعن دەفەرموێ: شەش جار) پاشان ویتری کرد دوایی ڕاکشا یان خەوت هەتا پڕخەی لێدەهات. چونکە عادەتی وابوو کەدەنوست پرخەی دەکرد، تا کاتێ کە بانگ بێژهات هەستاو دووڕکات نوێژی کورتی کرد [ ئەمە نوێژی سوننەتی پێش نوێژی بەیانییە سوننەتە کورت بکرێتەوە و چاك وایە لە ماڵەوە بکرێت ] پاشان دەرچوو نوێژی بەیانی کرد. لەڕیواتەکەی تردا: بیلال هاتو بانگی نوێژیداو ئەویش هەستاو نوێژی کردو دەست نوێژیشی نەگرتەوە .**

(١٦١) **عن ابن عباس قال: (كان النبي ﴿ﷺ﴾ يصلي من الليل ثلاث عشرة ركعة):** اخرجه البخاري ومسلم والترمذي (٤٤٢) و قال : حديث حسن صحيح .

**واتە: پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ لەشەودا سیانزە ڕکاتی شەو نوێژ دەکرد.[ واتە بەو دوو ڕکاتەی کە لە سەرەتایەوە دەیکرد، ئەمەش جیاوازی نییە لەگەڵ ئەوەدا کە پێغەمبەریخوا﴿ﷺ﴾ لە یانزە ڕکات زیاتری نەکردووە . چونکە مەبەست بەو دووڕکاتە زیادەیە دوو ڕکاتی سوننەتی فەجرە، یان ئەو دوو ڕکاتەیەکە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بە دانیشتنەوە دەیکرد دوای ویتر** ./ بڕوانە ( صحيح ابي داود ) رقم ( ١٢٠٥) و ( ١٢٣٠ ) و (١٢٣١) ] .

نەیتوانیایە بەشەو هەستێ ئەوا ڕۆژەکەی دوانزە ڕکاتی دەکرد[١٦٢] هەندێ جار لە شەودا نۆ ڕکاتی دەکرد[١٦٣] لە ڕەمەزانیشدا یانزە ڕکاتی دەکرد[١٦٤] .

---

(١٦٢) **عن عائشة: (أن النبي ﴿ﷺ﴾ كان إذا لم يصل بالليل منعه من ذلك النوم، أو غَلَبْتـهُ عيناه صلى من النهار ثنتَي عشرة ركعة)** اخرجه مسلم (١٤٠)والترمذي والنسائي .

واتە: پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ ئەگەر خەو زۆری بۆبهێنایەو شەو نوێژی نەکردایە یان خەو چاوەکانی قورس بکردایە ئەوا بۆ بەیانی دوانزە ڕکاتی دەکرد .

(١٦٣) **وعنها ايضاً قالت:(كان رسول الله ﴿ﷺ﴾ يصلي من الليل تسع ركعات ).** اخرجه البخاري ومسلم والترمذي (٤٤٢) وابو داود بزيادة في متنه انظر الصحيحة (١١٢١) .

واتە: پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ بەشەو نۆ ڕکاتی دەکرد .

(١٦٤) **عن ابي سلمة بن عبدالرحمن أنه سأل عائشة (رضیالله عنها):كيف كانت صلاة رسول الله ﴿ﷺ﴾ في رمضان؟ فقالت: ماكان رسول الله ﴿ﷺ﴾ ليزيد في رمضان ولا في غيره على احدى عشرة ركعة، يصلي أربعاً لاتسال عن حسنهن وطولهن ، ثم يصلي أربعاً لاتسأل عن حسنهن وطولهن، ثم يصلي ثلاثا، قالت عائشة(رضیالله عنها): قلت: يارسول الله: اتنام قبل أن توتر؟ فقال: ((ياعائشة إنّ عَينَيَّ تنامان ولاينام قلبي)).** اخرجه البخاري ومسلم والترمذي(٤٣٩) وصححه الترمذي و غيره.

واتە: لە ئەبی سەلەمەوە دەگێڕێتەوە پرسیاری لە عائیشە کرد: کە ئایا شەو نوێژی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ چۆن بووە؟ فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ نە لە ڕەمەزان و نە لە غەیری ڕەمەزاندا لە یانزە ڕکات زیاتری نەدەکرد، سەرەتا چوار ڕکاتی دەکرد مەپرسە چەند جوانو درێژبوو، پاشان چوار ڕکاتی تر مەپرسە لە جوانیو درێژیان ، پاشان سێ ڕکاتی دەکرد ، عائیشە فەرمووی: وتم ئەی پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ ئایا پێش ئەوەی نوێژە ویترەکەت بکەیت دەنویت؟ فەرمووی: عائیشە من هەردوو چاوەکانم دەخەونو بەڵام دڵم نانوێت.

**عن عائشة(رضیالله عنها): ( أن رسول الله ﴿ﷺ﴾ كان يصلي من الليل إحدى عشرة ركعة، يوتر منها بواحدة، فإذا فرغ منها اضطجع على شقّهِ الأيمن )** رواه البخاري ومسلم والترمذي (٤٢٠) . انظر (صحيح ابي داود ) (١٢٠٦) . وقال الالباني : ذكر الاضطجاع في هذه الرواية شاذ وهو بعد سنة الفجر .

واتە: پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ لەشەودا یانزە ركاتی دەکردو بەیەك ركات ویتر كۆتایی پێ دەهێناو کەلێ دەبوویەوە لەسەر لای ڕاستی ڕادەکشا . [بەڵام باسی ڕاکشانەکە لێرەدا ئەلبانی دەفەرموێ شازە، بەڵکو ئەو راكشانە لە دوای ئەنجام دانی سوننەتی بەیانیەوەیە].

## هەندێك جار نوێژەكەی درێژ دەكردەوەو قورئانی زۆر تێدا دەخوێندەوە(١٦٥)

(١٦٥) **عن حذيفة بن اليمان (τ) :أنه صلى مع النبي ﴿ﷺ﴾ من الليل ، قال: فلما دخل في الصلاة قال : ((الله اكبر ذو الملكوت والجبروت والكبرياء والعظمة )) قال : ثم قرأ البقرة . ثم ركع، فكان نحواً من قيامه . وكان يقول:(( سبحان ربّي العظيم . سبحان ربّي العظيم )) ثم رفع رأسه ، فكان قيامه نحواً من ركوعه، وكان يقول: ((لربّي الحمد. لربّي الحمد)) ثم سجد: فكان سجوده نحوا من قيامه، وكان يقول : ((سبحان ربي الاعلى . سبحان ربي الاعلى)). ثم رفع رأسه ، فكان بين السجدتين نحوا من السجود وكان يقول : (( ربّ اغفرلي، ربّ اغفرلي )) . حتى قرأ ( البقرة ) و ( آل عمران ) و ( النساء )و ( المائدة ) أو ( الانعام ). ( شعبه ) الذي شك في المائدة و الانعام )** .رواه ابوداود ( صحيح ابي داود ) (٨١٨) والنسائي وغيرهم كالبخاري. و مسلم بسياق اخر .

واتە: لە حوزەيفەوە كەوا شەوێك لەگەڵ پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ شەو نوێژی كردەوە دەفەرموێت: كاتێ نوێژی دابەست فەرمووی: (خوا گەورەیەو خاوەنی موڵك و شكۆو گەورەیی یە ) پاشان سورەتی البقرەی خوێند، پاشان چووە چەمینەوەو نزیكەی بە ئەندازەی بەپێوە وەستانەكەیو قورئان خوێندنەكەی پێچو، دەیفەرموو: ( پاكیو بێ گەردی بۆ پەروەردگاری گەورە ) پاشان سەری بەرز كردەوەو بەئەندازەی چەمینەكەی پێی چوو دەیفەرموو: ( ستایش بۆ پەروەردگارمە ) پاشان سەجدەی بردو بەئەندازەی هەستانەوە لە چەمینەوەی پێچوو دەیفەرموو: ( پاكیو بێگەردی بۆ پەروەردگاری بەرزمە ) پاشان سەری بەرز كردەوەو نێوان دووسەجدەكەی بەئەندازەی سەجدەكەی پێچوو دەیفەرموو: (پەروەردگار لێم خۆش ببە)، بە جۆرێلەو نوێژەدا سورەتی (البقرة ) و ( آل عمران ) و (النساء) و (المائدة ) یان (الانعام )ی خوێند ( شوعبە گومانی هەیە كە ئایا المائدة یان الانعام كامیانی خوێند).

**وعن عبدالله [أي ابن مسعود] قال : (صلّيتُ ليلةً مع رسول الله ﴿ﷺ﴾ . فلم يزل قائماً حتى هممت بأمر سوء ، قيل له: وما هممت به؟ قال: ( هممت أن أقعد و أدع النبيَّ ﴿ﷺ﴾ ! )** اخرجه البخاري ومسلم واحمد ١ / ٣٨٥ وابن ماجه .

واتە: شەوێكیان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﴿ﷺ﴾ شەو نوێژم كرد. بەردەوام ئەوەندە بە پێوە مایەوە هەتا شتێكی خراپ هات بە خەیاڵمدا. ووتیان : چی هات بە خەیاڵتدا ؟ فەرمووی: خەریك بوو دانیشتمو واز لە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بهێنم .

**وعن عائشة (رضىالله تعالى عنها): .(أن النبي ﴿ﷺ﴾ كان يصلي جالسا ، فيقرأُ وهو جالس . فاذا بقي من قرآءته قدرُ مايكون ثلاثين أو أربعين آية قام فقرأ وهو قائم، ثم ركع وسجد ، ثم صنع في الركعة الثانية مثل ذلك )** اخرجه البخاري ومسلم والترمذي (٣٧٤) وابوداود (٩٥٥) .

واتە: پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ بەدانیشتنەوە نوێژی دەكردو هەر بەدانیشتنەوە قورئانی دەخوێندەوە هەتا ئەوەی(سی) یان(چل) ئایەتی دەما ئەوجا هەڵدەستاو بە پێوە دەیخوێند پاشان چەمینەوەو سەجدەی دەبردو لە ڕكاتی دووەمیشدا وای دەكرد .

**وه هەندێ جار بە یەك ئایەت شەوێك شەو نوێژی كردووه[١٦٦]. بەڵام لە كۆتایی تەمەنی‌دا زۆرجار بە دانیشتنەوه نوێژی دەكرد[١٦٧]. وه نوێژی سوننەتی زۆری دەكرد[١٦٨].**

---

(١٦٦) **عن عائشة(رضي الله عنها) قالت: ( قام رسول الله ﴿ﷺ﴾ بآيةٍ من القران ليلة )** اخرجه الترمذي وقال الالباني : اسناده صحيح . رجاله ثقات على شرط مسلم . وللحديث شاهد من حديث أبى ذر مفصلا مخرجا صححه الحاكم والذهبي. **واتە: پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ شەوێكیان بەیەك ئایەت شەو نوێژی كرد [ واتە: دوای سورەتی الفاتحە هەر ئەو ئایەتەی دووبارە دەكردەوە ] .**

(١٦٧) **عن عائشة(رضي‌الله عنها): (أن النبي ﴿ﷺ﴾ لم يَمُت حتى كان أكثرَ صلاتهِ وهو جالس)** اخرجه الترمذي وقال الالباني: اسناده صحيح. رجاله كلهم ثقات رجال الشيخين غير عثمان بن ابي سليمان فان البخاري انما اخرج له تعليقا واحتج به مسلم وأخرج حديثه هذا (١١٦) بلفظ**(...كثير من صلاته وهو جالس)**.

**واتە: پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ پێش وەفات كردنی زۆربەی نوێژەكانی بەدانیشتنەوه دەكرد .**

(١٦٨) **وعن ابن عمر (رضي الله عنهما)قال: ( حفظت من رسول الله ثماني ركعات ،ركعتين قبل الظهر . وركعتين بعدها . وركعتين بعد المغرب ، وركعتين بعد العشاء . قال ابن عمر : وحدثني حفصة بركعتي الغداة . ولم أكن أراهما من النبي ﴿ﷺ﴾).** اخرجه الشيخان والترمذي (٤٣٣) وقال : حسن صحيح . وغيرهم .

**واتە: هەشت ڕكات نوێژی سوننەتم لە پێغەمبەرەوه ﴿ﷺ﴾ لەبەر كردووه كە كردوونی: دووڕكات پێش نیوەڕۆ. دووان لەدوایەوه. دووڕكات پاش مەغریب. دووان لە دوای عیشا. ابن عمر دەفەرموێت: وه حەفصەش هەواڵی دامێ بە دووڕكات پێش بەیانی. بەڵام من خۆم نەمبینیوه لە پێغەمبەرەوه ﴿ﷺ﴾ كە كردبێتی [ چونكە لە ماڵەوه دەیكرد].**

**عاصم بن ضمرة يقول : سألنا علياً (كرم الله وجهه) عن صلاة رسول الله ﴿ﷺ﴾ من النهار ؟فقال : إنكم لاتطيقون ذلك، قال: فقلنا: من أطاق ذلك منا صلى. فقال: (كان اذا كانت الشمس من ههنا كهيئتها من ههنا عند العصر صلى ركعتين، واذا كانت الشمس من ههنا كهيئتها من ههنا عند الظهر صلى أربعا ، ويصلي قبل الظهر أربعا، ( وذكر أن رسول الله ﴿ﷺ﴾ كان يصليها عند الزوال ويمد فيها / ٢٩٨ ) وبعدها ركعتين ، وقبل العصر اربعا ، يفصل بين كل ركعتين بالتسليم على الملائكة المقربين ،والنبيين، ومن تبعهم من المؤمنين و المسلمين )**اخرجه الترمذي (٤٢٤) و (٤٢٩) و (٥٩٨) وقال: حديث حسن،واحمد والنسائي وابن ماجه .انظر الصحيحه (٢٤٠) و (٢٧٠٥) .

**واتە: عاصمی كوڕی ضەمرە دەفەرموێ: پرسیارمان لە عەلی كرد دەربارەی نوێژە سوننەتەكانی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ لە ڕۆژدا؟ فەرمووی: ئێوه ناتوانن ئەوه بكەن. دەفەرموێ: ووتمان كێ لە ئێمە توانی دەیكات. فەرمووی: كاتێ خۆر لێرەوه وەكو ئەو كاتەی لێ دەهات كە لەعەسردا لێی‌دێت دووڕكاتی دەكرد [دوو ڕكاتی الضحی] . وەكاتێ خۆر لەملاوه وەكو ئەو كاتەی لێ دەهات كەلە نیوەڕۆدا لێی‌دێت چوار ڕكاتی دەكرد . وه لەپێش نیوەڕۆدا چواری دەكرد(وەباسی ئەوەی كرد كە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ لە كاتی لادانی خۆر لەناوەڕاستی ئاسمان دا دەیكردن و درێژی دەكردنەوه)، وەدوای نیوەڕۆش دووڕكات ، پێش عەسریش چوار ڕكاتی دەكرد نێوانی دەخستنە بەینی بە سڵاودانەوه لە فریشتە نزیكەكان و پێغەمبەران و شوێن كەوتوانیان لە ئیمانداران و موسوڵمانان .**

## نوێژی چێشت هەنگاوی (الضُّحى)

**پێغەمبەری خوا ﷺ چوار ڕکات.[١٦٩] یان زیاترو شەش[١٧٠] یان تا هەشت ڕکاتی نوێژی چێشت هەنگاوی دەکرد[١٧١] .**

---

(١٦٩) **مُعاذة قالت : قلت لعائشة (رضیالله عنها): أكان النبي ﷺ يُصلي الضحى ؟ قالت: ( نعم، أربع ركعات ، و يَزيد ماشاء الله عزوجل )** اخرجه مسلم (٧١٩) واحمد وغيرهم .

واتە: ووتم بە عائیشە: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی چێشت هەنگاوی دەکرد ؟ فەرمووی: بەڵێ: چوار ڕکاتی دەکردو چەند خوای گەورە وویستی بوایە زیاتری دەکرد. [ لایەنە کەمەکەی دوو ڕکاتو ئەو پەڕیەکەی هەشت ڕکاتە ] .

(١٧٠) **عن انس بن مالك: ( ان النبي ﷺ كان يصلي الضحى ست ركعات )** اخرجه الترمذي وتفرد به في الشمائل ( الجامع الصغير ) وهو صحيح لغيره ،الارواء (٤٦٣) .

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ شەش ڕکات نوێژی چێشت هەنگاوی دەکرد .

(١٧١) **عن عبدالرحمن بن أبي ليلى قال: ما أخبرني أحد أنه رأى النبي ﷺ يصلي الضحى إلا اُم هانيء (رضي الله تعالى عنها)، فانها حدَّثت: ( أن رسول الله ﷺ دخل بيتها يوم فتح مكة فاغتسل ، فَسَبَّح ثمان ركعات ، ما رأيته ﷺ صلى صلاة قط اخفَّ منها ، غير أنه كان يُتمُّ الركوع والسجود )** اخرجه البخاري ومسلم (٣٣٦) والترمذي (٤٧٤) وغيرهم .

واتە: هیچ کەسێك هەواڵی پێ نەداوم کە پێغەمبەری خوای ﷺ بینیبێ نوێژی چێشت هەنگاوی کردبێت جگە لە اُم هانئ . ئەو فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ لەڕۆژی فەتحی مەککەدا هاتە ماڵەکەیو خۆی شتو هەشت ڕکاتی کرد . هیچ نوێژێکم نەدیوە هەرگیز کە لەوە کورتری کردبێتەوە جگە لەوەی کە بەتەواوی چەمینەوەو سەجدەکانی دەبرد .

**وعن أبي أيوب الأنصاري (τ): أن النبي ﷺ كان يُدمنُ أربع ركعاتٍ عند زوال الشمس ، فقلت: يارسول الله! انك تُدمنُ هذه الأربعَ ركعات عند زوال الشمس ؟ فقال: (( إن أبواب السماء تُفتح عند زوال الشمس فلا تُرتَجُ حتى يُصلّى الظهر: فأحبُّ ان يصعد لي في تلك الساعة خير)) . قلت: أ في كُلّهنّ قراءةٌ ؟ قال: (( نعم)). قلت: هل فيهن تسليمٌ فاصلٌ ؟ قال: ((لا )).** اخرجه ابوداود (١٢٧٠) وابن ماجه والترمذي . وله طريق اخرى . انظر ( صحيح ابي دواد ) (١١٥٣) .

**واتـه: پێغەمبـەری خـوا ﴿ﷺ﴾ بـەردەوام بـوو لەسـەر ئـەنجام دانـی چـوار ڕکـات نوێـژی کاتی لادانی خـۆر لـه ناوەڕاستی ئاسمـان ( الضـحی ) . ووتم: ئـەی پێغەمبـەری خـوا ! تـۆ بەردوامی لەسەر ئەنجام دانی ئەم چوار ڕکاتە لەکاتی لادانی خۆر له ناوەڕاستی ئاسمـان؟ فـەرمووی: دەرگاکـانی ئاسمـان لـه کـاتی ( زەوال ) [لادانـی خـۆر لەناوەڕاسـتی ئاسمانـدا] دەکرێتەوەو داناخرێت هەتا نوێژی نیـوەڕۆ دەکرێـت، بۆیـە پـێم خۆشـە لـەو کاتـەدا خێـرو چاکەیەکم هـەبێتو سـەرکەوێت. ووتم ئایـا لـە هـەموو ڕکاتێکیـدا قورئـان دەخوێنـدرێ ؟ فـەرمووی: بـەڵێ . ووتم: ئایـا لـە نێوانیانـدا سـەلام دەدرێتـەوەو بـەینی تـێ دەخرێـت ؟ فەرمووی: نەخێر .**

(١٧٢) **عن عبدالله بن سعد [ او سعيد ] قال: سألتُ رسول الله ﴿ﷺ﴾ عن الصلاة في بيتي ،والصلاة في المسجد ؟ قال: (( قد ترى ما اقرب بيتي من المسجد، فلان اصلّي في بيتي أحبُّ إليَّ من ان أصليَّ في المسجد، الا ان تكون صلاةً مكتوبةً )).** اخرجه ابن ماجه(١٣٧٨). قال الألباني: واسناده صحيح لولا ان فيه العلاء بن الحارث وكان اختلط لكن له شاهد قوي من حديث زيد بن ثابت. وهو في (صحيح ابي دواد) (٩٥٩) .

**واتـه: پرسـیارم کـرد لـه پێغەمبـەری خـوا ﴿ﷺ﴾ دەربـاری نوێـژکردنم لـه ماڵـەوەو لـه مزگەوتـدا [کـه ئایـا کامیـان باشـترە ]؟ فـەرمووی: خـۆت دەبینـی چـەندێك ماڵم نزیکـە لـە مزگەوتـەوە . خـۆ ئەگـەر نوێـژە سـوننەتەکانم لـە ماڵـەوە بکـەم پـێم خۆشـترە لـەوەی لـە مزگـەوت دا بیکـەم . مەگـەر لـە نوێـژی فەرزەکانـدا بێـت[کـەدیارە فـەرزەکان لەمزگەوتـدا چاکترەو خێری زیاترە ] .**

# زوهدو دونیا نەویستنی

پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ لەسەر حەسیرێك ڕادەكشا جێگەكەی لە لەشی پیرۆزیدا دەردەچوو(١٧٣) وە لە ماڵی دونیا هیچی لەلای خۆی گل نەدەدایەوە(١٧٤)

---

(١٧٣)لە عەلقەمەوە لە ابن مسعودەوە فەرمویەتی:(**اضطجع رسول الله على حصير، فأثر الحصير بجلده، فجعلت امسحه واقول: بأبي أنت وامي، ألاآذنتنا فنبسط لك شيئا يقيل منه تنام عليه؟ قال: (( مالي وللدينا، ماأنا والدنيا إلا كراكب استظل تحت شجرة ثم راح وتركها ))** رواه الترمذي وقال : حسن صحيح . وصحيح جامع الصغير مجلد (٥) رقم ( ٥٥٤٤ )

واتە: ابن مسعود فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر حەسیرێك ڕاكشابوو جێگەی حەسیرەكە لە لاشەیدا دەرچوو بوو، منیش دەستم دەهێنا بە لەشیداو دەمووت: باوك و دایكم بەفیدات بن ئەگەر ڕێگەمان بدەیت هەتا شتێكمان بۆ ڕاخستیتایە تا نارەحەتی نەكردیتایەو لەسەری بخەوتیتایە؟ فەرمووی: من چیمە بە دونیاوە، نمونەی منو دونیا وەكو سوارێكی ڕێبوار وایە كە لەژێر سێبەری دارێكدا كەمێك دەحەوێتەوەو پاشان دەڕواو بەجێی دەهێڵێ .

وە لە عومەری كوڕی خەطابەوە لە فەرموودەی باسی سوێندەكەی پێغەمبەری خوادا ﷺ هاتووە كە لەخێزانەكانی خوارد كەیەك مانگ ناچێتە لایان ولێیان دووركەوتەوەو كەناری گرت لەبەرزاییەكدا، كاتێك عومەر چوو بۆ لای، تەماشای كرد ئەو جێگایە هیچی تێدا نیە جگە لە كەمێك گەڵای (سلم) كە پێستەی پێ خۆش دەكریو جەوەندەیەك ئاوی هەڵواسراوو كەمێك جۆ. وە خۆشی لەسەر حەسیرێك ڕاكشاوە كەجێگای حەسیرەكە لە لاشەیدا دیارە، بۆیە چاوەكانی عومەر پڕ بوون لە فرمێسك، پێغەمبەریخوا ﷺ فەرمووی:((**مالك ؟**))واتە: چیتە، دەفەرموێ: ووتم: ئەی پێغەمبەری خوا تۆ پاكترین دروست كراوەكانی خوایتو [ ئەمەیە حاڵت ] وە كیسراو قەیسەریش لەو رابواردنەدان كە دەبینری، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووی سوور هەڵگەڕاو دانیشتو فەرمووی: ئایا گومانت هەیە لەمندا ئەی كوڕەكەی خەتاب؟ پاشان فەرمووی: ئەوانە كۆمەڵو گەلێكن خۆشیو ڕابواردنیان بۆ پێش خراوە بۆ ژیانی دونیایان) متفق عليه .

وە لە ڕیوایەتی موسلیمدا فەرمووی:(( **أما ترضى أن تكون لهم الدنيا و لنا الآخرة** )).واتە: ئایا ڕازی نیت كە دونیا بۆ ئەوان بێتو قیامەتیش بۆ ئێمە. ووتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دە سوپاسو ستایشی خوای گەورە بكە [لەسەر هەموو وەزعێك ].

(١٧٤) وە دەفەرموێت ﷺ :((**لو أن لي مثل أُحُد ذهباً، ماسرَّني أن تأتي عليَّ ثلاث ليال، وعندي منه شيء، الا شيء أرصده لديني**)) رواه البخاري .

واتە: ئەگەر بەوێنەی چیای ئوحد ئاڵتونم هەبێت دڵ خۆشم ناكات سێ شەو بەسەرمدا تێ بپەڕێتو شتێكم لێی لەلا مابێت، مەگەر شتێك كە تەرخانی بكەم بۆ دینەكەم [واتە: بیكەمە خێر، ئەو كاتە دڵخۆشم دەكات ] .

# ژیان و برسێتی پێغەمبەر ﷺ

خوای پەروەردگار بێ نیازی کردبوو لە غەیری خۆی[(١٧٥)] ، جار بووە مانگ دەڕۆیشت و بگرە دوو مانگ دەگەڕایەوەو ئاگر نەدەکرایەوە لە ماڵیدا، وە زۆربەی خواردنیان ئاوو خورما بووە[(١٧٦)]. جاریش هەبووە خورماشیان دەست نەدەکەوت[(١٧٧)]. زریێکەشی دابوو بە ڕەهن لە بری قەرزێك[(١٧٨)] .

---

(١٧٥)خوای گەورە دەفەرموویت : ﴿ ووجدك عائلا فأغنى ﴾ سورة الضحى .

واتە: تۆ هەژارو بێ دەسەڵات بوویت خوای گەورە دەوڵەمەندو بێنیازی کردیت لە غەیری خۆی.

(١٧٦) عائیشە دەفەرمویت:(**إن كنا آل محمد، لَيَمُرُّ بنا الهلال، مانوقد نارا، انما هما الأسودان: التمر والماء، إلا أنه كان حولنا أهل دور من الأنصار، يبعثون إلى رسول الله بلبن منائحهم، فيشرب ويسقينا من ذلك اللبن** ) متفق عليه .

**وفي رواية: (كان يمر الهلال والهلال والهلال، ثلاثة أهلة وما يوقد في بيت رسول الله عليه السلام نار ، قيل : ماكان يعيشكم يا خالة ؟ قالت: الأسودان التمر والماء)** رواه البخاري رقم (٣٣٧٩) .

واتە: ئێمە کەس‌وکاروخێزانی پێغەمبەر ﷺ مانگی یەك شەوە دەگەڕایەوە بەسەرماندا ئاگرمان نەدەکردەوە بۆ خواردن لێنان ، بەڵکو هەر دوو شتە ڕەشەکەمان شك دەبرد: خورماو ئاو. جگە لەوەی لە چواردەورمان چەند ماڵیکی ئەنصاری هەبوون لەشیری مەڕو ووشترەکانیان دەنارد بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش لێی دەخواردەوەو بەشی ئێمەشی لێدەدا .

(١٧٧) عومەری کوڕی خەطاب دەفەرموویت: ( **لقد رأيت رسول الله (ﷺ) يلتوي من الجوع، ما يجد مايملأ من الدقل بطنه)** . رواه مسلم ٤ / ٢٢٨٤ ، ٢٢٨٥ رقم (٢٩٧٧ ، ٢٩٧٨ ) و غيره .

واتە: ئەمبینی پێغەمبەری خوا ﷺ لە برساندا سکی هەڵدەگوشی‌و ئەوەندەی خورمای ( الدقل ) [ واتە ووشك‌و خراپ] شك نەدەبرد سکی پێ تێر بکات .

(١٧٨) وە لەئەنەسەوە کەوا جارێکیان نانی‌جۆو ڕۆنێکی بۆن گۆڕاوو کۆن بووی بۆ برد، وەزریێیەکەشی دانابوو بەڕەهن لەلای جولەکەیەك و نانێکی جۆی بۆ خێزانەکەی دروست کرد. وەدەفەرمووێ: ڕۆژێکیان لێم بیست دەیفەرموو:(**(ماأمسى عند آل محمد صاع تمر ، ولا صاع حب ))** رواه البخاري .

واتە: ماڵ‌و خێزانی پێغەمبەر ﷺ ئێوارەیەکیان بەسەردا نەهاتووە کە صاعێك [ دەفرێکە دوو یان چوار مشت دەگرێت ] لە خورما یان دانەوێلە هەبێت.

جار بووه به برسێتی چەندان ڕۆژیان لێ بووەتەوەو زۆربەی نانیان نانی جۆ بووە[١٧٩] . وەلەو ڕۆژەوە کە هاتنە شاری مەدینە سێ ڕۆژ لەسەریەك تێریان لە نانی گەنم نەخوارد هەتا وەفاتی کرد[١٨٠] . وە دەپاڕایەوە کە خوای گەورە ئەوەندەیان پێ ببەخشێ کە تەنها جێی برسێتی بگرێت[١٨١] وە هەرگیز بە چاوی خۆی لە ماڵی خۆیدا نانی گەنمی سپیومەڕی برژاوی نەبینی هەتا گەیشت بەخوای پەروەردگارو وەفاتی کرد[١٨٢] .

---

(١٧٩) **( كان يبيت الليالي المتتابعة طاويا واهله ، ولايجدون عشاء، وكان أكثر خبرهم الشعير).** حديث حسن رواه احمد وغيره .

واتە: چەندان شەوی لەسەریەك بەسەر خۆیو خێزانەکانیدا دەڕۆیشتو ڕۆژیان لێ دەبویەوەو خواردنی ئێوارەیان شك نەدەبرد . زۆربەی نانەکەشیان نانی جۆ بوو .

(١٨٠) وە لەعائیشەوە(ڕەزای خوای لێبێت) فەرموویەتی: **( ماشبع آل محمد ﴿ﷺ﴾ منذ قدموا المدينة - ثلاث أيام تباعا - من خُبز بُرّ ، حتى مضى لسبيله ) - أي مات** - متفق عليه .

واتە: خانەوادەو خێزانەکانی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ لەو کاتەی هاتنە شاری مەدینە -سێ ڕۆژ لەسەر یەك - تێریان نەخوارد لەنانی گەنم ، هەتا گەیشت بە خوای گەورەو وەفاتی کرد .

(١٨١) پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ دەیفەرموو: **(( اللهم اجعل رزق آل محمد قوتاً))** متفق عليه.

واتە: خوایە رزقو رۆزی خانەوادەو خێزانی محمد ﴿ﷺ﴾ ئەوەندە بێت کە جێی برسێتی بگرێت .

(١٨٢) لەئەنەسەوە فەرموویەتی :**(ما أعلم رسول الله ﴿ﷺ﴾ رأى رغيفاً مُرققاً ، حتى لحق الله، ولاشاة سميطا بعينه قط )** رواه البخاري .

واتە: نازانم و شك نابەم کەوا پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ نانی گەنمی سپی ناسکی بینیبێ تا گەیشت بە خوای گەورەو، هەرگیز مەڕێکی برژاوی بەچاوی خۆی نەبینی .

وه جاری وابووه له برساندا لەماڵ دەرچووەتە دەرەوە[١٨٣] .

---

(١٨٣)شەوێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ لەماڵ دەردەچێتە دەرەوە، لەپڕ دەگات بەئەبا بەکر کە دانیشتووە لەگەڵ عومەردا(ڕەزایخوایان لیٚبێت) کە ئەوانیش لە ماڵ دەرچوون .

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: چی شتێك ئێوەی لەم کاتەدا دەرکردووە ؟

ابوبکرو عومەر: برسێتی ئەی پێغەمبەری خوا ! !

پێغەمبەری خوا ﷺ :منیش سوێند بەو خوایەی نەفسی منی بەدەستە ئەو شتەی ئێوەی دەرکردووەهەر ئەوە منیشی لەماڵ دەرکردووە .

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانیان پیٚدەکات کەهەڵسن، و لەگەڵیدا هەڵدەستنو دەچن بۆ ماڵی یەکێك لە پیاوە ئەنصارییەکان کەناوی (ابو الهیثم مالك یکوڕی التیهان )ە ، بەلاٌم لەماڵ نەبوو . خیزانەکەی [ لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ دەدویٚو دەفەرمویٚ:] مرحبا وأهلا . بەخێر هاتن .

پێغەمبەر ﷺ: ئەوە فلاٌن کەس لەکوییە ؟ [واتە ابا الهیثم ].

خێزانەکەی: چووە ئاومان بۆ بێنیٚ ؟ [ واتە ئاوی خواردنەوە ].

لە پڕ أبو الهیثم دێتەوەو تەماشای پێغەمبەری خوا ﷺ و دوو هاوەڵەکەی دەکات و دەچێت بۆلای پێغەمبەرو باوكو دایکی خۆی دەکات بە فیدای .

ابو الهیثم : سوپاس بۆ خوای گەورە هیچ کەسێك لەمن میوانی بەڕێزتری نییە !

ابو الهیثم دەڕواتو شولێك خورما دێنیٚ کە خورمای وشك (بسر)و تەڕ (تمر) وشل ونەرم ( رُطَب )ی پێوەیە. [کەجۆرەکانی خورمایە لەکاتی پێگەیشتنیدا ] .

ابو الهیثم : فەرمووو لەمە بخۆن ..

پاشان چەقۆیەك هەڵدەگریٚو دەڕوات تا مەڕێك سەر ببڕیٚ بۆیان .

پێغەمبەر ﷺ دەفەمویٚ: نەکەی ( الحلوب ) سەربڕی [ واتە ئاگاداربە مەڕی شیردار سەرنەبڕی ] ئینجا پێغەمبەریخوا ﷺ و دوو هاوەڵەکەی لەو خورماو گۆشتە دەخۆنو ئاوی سازگاری دەکەن بەسەردا هەتا تێر دەخۆن . پاشان ( بە ئەبوبەکرو عومەر ) دەفەرموێت: **(( والذي نفسي بيده لتسألن عن هذا النعيم يوم القيامة، أخرجكم من بيوتكم الجوع، ثم لم ترجعوا حتى أصابكم هذا النعيم !))** الحديث رواه مسلم ومالك والترمذي .

واتە: سوێند بەو خوایەی نەفسی منی دەستە لە ڕۆژی دواییدا دەربارەی ئەم نیعمەتە پرسیارتان لیٚدەکرێت . برسێتی لەماڵ دەری کردن . پاشان نەگەڕانەوە هەتا تووشی ئەم نیعمەتەی کردن . ... **<u>لەسوودەکانی ئەم فەرموودەیە :</u>**

١- پێغەمبەر ﷺ و هاوڕێکانی برسێتی زۆری بۆ دەهێنانو لەماڵ دەری دەکردن تا خواردنێك بدۆزنەوە .

٢- هیچی تێدا نییە ئەگەر پیاوێك بچێت بۆ ماڵی یەکێك لە هاوڕێکانی بۆ نان خواردن.

٣- ئاگادار بوون لە فەزڵی نیعمەت و سوپاس کردنی خوای بەدیهێنەر لەسەری .

٤- هاوەڵە بەرێزەکان یارمەتی خێزانەکانیان دەدا لە کاروباری ماڵ بەڕێوەبردندا .

( ئایا پارێزەران و کاوێژکارانی درووشمی مافی ئافرەتان ئاوا دەکەن)؟؟!!

# ڕۆژوو گرتنی

پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ ڕۆژوی سوننەتی زۆردەگرت و هەندێجار زۆربەی مانگەکەی دەگرت، بەڵام جگە لە ڕەمەزان هیچ مانگێکی سەراپا نەگرتووە[١٨٤]. لەو مانگانەش کە دەیگرتن و زۆر تیایدا بە ڕۆژوو دەبوو وەك: مانگی شەعبان[١٨٥]. وە سێ ڕۆژی لە سەرەتای هەموو مانگێکدا دەگرت[١٨٦]

---

(١٨٤)**عن عبدالله بن شقيق قال: سألت عائشة (رضيالله عنها) عن صيام رسول الله ﴿ﷺ﴾؟ قالت :(كان يصوم حتى نقول: قد صام، و يُفطر حتى نقول: قد أفطر. قالت: و ما صام رسول الله ﴿ﷺ﴾ شهراً كاملاً منذ قدم المدينة إلا رمضان )** أخرجه البخاري ومسلم والترمذي (٧٦٨) وابوداود (صحيح ابي داود )(٢١٠٣) والنسائي .

واتە: پرسیارم لە عائیشە کرد دەربارەی ڕۆژوو گرتنی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾؟ ئەویش فەرمووی : جاری وابووە ئەوەندە بەرۆژوو دەبوو هەتا دەمانوت هەموو مانگەکەی گرت، جاری واش بووە نەیدەگرت هەتا دەمانووت هیچی لێ نەگرت. فەرمووی: وە پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ لەو ڕۆژەوەی هاتە ناو شاری مەدینە هیچ مانگێکی سەراپا نەگرت جگە لەڕەمەزان .

(١٨٥) **عن أُمِّ سلمة قالت :(مارأيت النبي ﴿ﷺ﴾ يصوم شهرين متتابعين الا شعبان ورمضان).** اخرجه الترمذي (٧٣٦) واسناده صحيح كما قال، وابوداود ( صحيح ابي داود ) (٢٢٠١و ٢١٠٤) النسائي .

واتە: پێغەمبەری خوام ﴿ﷺ﴾ نەبینیوە کە دوو مانگی لەسەر یەك گرتبێ جگە لە شەعبان و ڕەمەزان .

**وعن عائشة قالت: (لم أر رسول الله ﴿ﷺ﴾ يصوم في شهر أكثر من صيامه لله في شعبان، كان يصوم شعبان إلا قليلا، بل كان يصومه كله).** اخرجه مسلم و النسائي واحمد وسنده صحيح والترمذي (٧٣٧) .

واتە: پێغەمبەرم ﴿ﷺ﴾ نەبینیوە هیچ مانگێك بە ئەندازەی مانگی(شەعبان) بەڕۆژوو بووبێ تیایدا بۆ خوای گەورە ، بەجۆرێ هەموو مانگی شەعبانی دەگرت کەمێکی نەبێت . یان پێدەچێ هەمووشی گرتبێ .

(١٨٦) **عن عبدالله [ابن مسعود]قال: ( كان رسول الله ﴿ﷺ﴾ يصوم من غرّةِ كل شهرٍ ثلاثة أيام ، وقلّما كان يفطر يوم الجمعة) .** اخرجه الترمذي (٧٤٢) وحسنه وابوداود (٤٢٥٠) والنسائي واحمد وصححه ابن خزيمه وهو مخرج في صحيح ابي داود (٢١١٦) .

واتە: پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ لە سەرەتای هەموو مانگێکدا سێ ڕۆژ بەڕۆژوو دەبوو . وەکەم ڕووی داوە ڕۆژی جومعە بەرۆژوو نەبووبێ .

[ واتە بە تەنها نا، بەڵکو ڕۆژێکی پێشەوەشی لێ گرتووە لەگەڵیدا ] .

وه دووشــەممەو پێــنج شــەممان[(١٨٧)] مانگێــك (شــەممەو یــەك شــەممەو دووشـەممە )و مانگەکـەی تـر ( سێشـەممەو چوار شـەممەو پێـنج شـەممە)ی دەگرت[(١٨٨)]. سێ ڕۆژیشی لە هەموو مانگێك دەگرت[(١٨٩)].

---

(١٨٧)**عن عائشة قالت: (كان النبيّ ﷺ يَتَحرّى صومَ الإثنين والخميس ).** اخرجه الترمذي (٧٤٥) وحسنه وابن ماجه (٧٣٩) والنسائي واسناده صحيح (الارواء) ٤/١٠٥و١٠٦ .

**واتـە: پێغەمبـەری خـوا ﷺ ڕۆژانـی دووشـەممەو پێـنج شـەممەی دەگـرت و بـە دوایاندا دەگەڕا تا بە ڕۆژوو بێت تیایاندا.**

**وعن أبي هريرة: أن النبي ﷺ قال: (( تُعرَضُ الأعمال يوم الإثنين والخميس ، فَأُحِبُّ أن يُعرَضَ عَمَلي وأنا صائمٌ ))** . اخرجه الترمذي (٧٤٧)وقال :حديث حسن غريب . قال الالباني : بل هو ضعيف الاسناد صحيح المتن . فان له شاهدا اخرجته مع الحديث في الارواء ( ٩٤٨ – ٩٤٩ ) .

**واته: ڕۆژانی دووشەممەو پێنج شەممان کردەوەکان بەرزدەکرێتەوەو نیشانی خوای پەروەردگار دەردێ، لەبەر ئەوە حەز دەکەم بەڕۆژوبم کە کردەوەکانم بەرز دەکرێتەوە .**

(١٨٨) **عن عائشة قالت: (كان النبيُّ ﷺ يصومُ من الشهر السبت والاحد والاثنين، ومن الشهر الآخر الثلاثاءَ والاربعاءَ والخميس)** اخرجه احمد وابن ماجه نحوه قال الالباني : واسناده صحيح وهو مخرج في ( المشكاة) ( ٢٠٥٩ ) .

**واتــە: پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە مانگێـك شــەممەو یـەك شــەممەو دووشــەممەو لەمانگەکەی تر سێ شەممەو چوار شەممە پێنج شەممەی دەگرت.**

**[ ڕواڵـەتی ئـەم فەرموودەیـە پێچـەوانەی فـەرمودەی(( لاتصوموا يوم السبت الا فيما افترض عليكم..))** الارواء (٩٤٢) وانظر (صحيح الترغيب والترهيب ) (١٠٤٠) . **واتـە: ڕۆژی شـەممە بـەڕۆژوو مـەبن مەگـەر لـەوەدا کـە فـەرزکراوە لـە سـەرتان، بـەڵام زاناکـان دەفـەرمون: فـەرموودەی دووەم(قەوڵی)یـە لەبەرئـەوە پـێش دەخرێت بەسـەر فەرموودەیـەی یەکەمداکـە (عەمەلی‌یە)،پاشـانیش فـەرمودەی دووەم قەدەغەکردنـە بەهـەمان شـێوە پـێش دەخرێـت بەسەر یەکەمدا]** .

(١٨٩) **معاذة قالت: قلت لعائشةَ: أكان رسولُ الله ﷺ يصوم ثلاثةَ أيام من كلّ شهر؟ قالت :نعم، قلت: من أيِّه كان يصوم؟ قالت: ( كان لايبالي من أيِّه صام ).** اخرجه الترمذي قال الالباني : اسناده صحيح على شرط مسلم . وقد اخرجه هو وابن خزيمة في صحيحيهما وابوداود. وهو مخرج في (صحيحه) (٢١١٧)

**واتـە: بـە عائیشـەم ووت: ئایـا پێغەمبـەری خـواﷺ لـە هـەموو مانگێـك سـێ ڕۆژ بـەڕۆژوو دەبـوو؟ فـەرمووی: بـەڵێ. وتم: لەچـەندی‌دا بـەڕۆژو دەبـوو؟ فـەرمووی: گـوێی نەدەدایە لە هەرکوێیەکی بوایە دەیگرت .**

وه ڕۆژی (عاشورا)یش كه دهكاتـه(١٠)مـانگی موحـهڕڕهم [١٩٠] .وه حـهزی لـه بهردوام بوون بووه لهسهر كاری خێرو چاكهو ئهوهی پێ خۆش بووه[١٩١] .

---

(١٩٠) **عن عائشة قالت: ( كان عاشوراء يوماً تصومه قـريش في الجاهليـة، وكـان رسـول الله ﴿ﷺ﴾ يصومه، وفلما قَدمَ المدينة صامه، وامر بصيامه، فلما افتُرضَ رمضـانُ كـان رمضـانُ هـو الفريضة. وترك عاشوراء. فَمن شاء صامه، ومن شاء تركه)** اخرجه الترمذي(٧٥٣). وقال: حديث صحيح. والبخاري ومسلم وهو في(مختصر البخاري) رقم (٩٨٠).

واتـه: ڕۆژی عاشـورا ڕۆژێـك بـوو قـورهیش لـه نهفامیـدا تیایـدا بـه ڕۆژوو دهبـوون و پێغهمبهریش ﴿ﷺ﴾ دهیگرت، كاتێ هاته ناو شاری مهدینه گرتی و فهرمانیشی كرد به ڕۆژوو بوون تیایدا، بهڵام كاتێ ڕهمهزان فهرزكرا [لهساڵی دووی كۆچیدا ] ڕهمـهزان بـووه فهرزهكهو وازیان له عاشورا هێنا. جا هەركـهس بیویستایه دهیگرت و هەركـهس ویستی نهبوایه بهڕۆژونهدهبوو تیایدا . __هۆی عاشوراكهش ئهمهبوو :__

**عن ابن عباس انه ﴿ﷺ﴾ لما قدم المدينة وجد اليهود تصوم عاشوراء. فسألهم عـن ذلـك فقالوا: هذا يوم نجى الله فيه موسى و أغرق فيه فرعون و قومه فصامه شكراً فنحن نصومه، فقال ﴿ﷺ﴾: ((نحن أحق بموسى منكم)) . فصامه و أمر صيامه).** اخرجه الشيخان .

واته: كاتێ پێغهمبـهر﴿ﷺ﴾ هاتـه مهدینـه بینـی جولهكـهكان ڕۆژووی عاشـورا دهگـرن . پرسیاری لێكردن لهم بارهوه ئهوانیش ووتیان : ئهمه ڕۆژێكه خوای گـهوره تیایـدا موسـا پێغهمبـهری (ﷺ) ڕزگـار كـردو فیرعـهون و گهلهكـهی خنكانـد . لهبهرئـهوه ( موسـی ) لهسوپاسی خوای گهورهدا تیایدا بهڕۆژوو دهبوو ئێمهش دهیگرین .

پێغهمبـهر﴿ﷺ﴾ فـهرمووی: ئێمـه لهپێشـترین بـۆ موسـا لـه ئێـوه . بۆیـه بـهڕۆژوو بـوو فهرمانیشی كرد كه موسوڵمانان بهڕۆژووبن تیایدا .

(١٩١)**عن عائشة قالت: دخل عليّ رسول الله ﴿ﷺ﴾ وعندي امرأةٌ . فقال: ((من هذه؟)) قلت : فلانةٌ لاتنام الليل ، فقال رسول الله ﴿ﷺ﴾ ((عليكم من الاعمال ماتطيقون . فوالله لايمل الله حتى تملوا)) وكان احب ذلك الى رسول الله ﴿ﷺ﴾ الذي يدوم عليه صاحبه )** اخرجه البخاري ومسلم (٢٢١) وهو في مختصر البخاري رقم (٣٣) (وصحيح ابي داود ) (١٢٣٨) والترمذي

واتـه: پێغهمبـهری خـوا ﴿ﷺ﴾ گـهڕاوه بـۆ مـاڵ بـۆلاەو منـیش ئـافرهتێكم لـهلادابوو [ ناوی حهولائی كچی توبتی كوڕی حبیب له هۆزی خدیجه بـوو ] فهرمووی: ئهمه كێیـه ؟ ووتم فلانـه ئافرهتـه بهشـهو نانوێـت و هـهر شـهو نوێـژدهكات . پێغهمبـهر ﴿ﷺ﴾ فـهرمووی ئهوهنده كاروكردهوه بكهن كه تواناتـان ههیـه . سـوێند بـهخوا خـوای گـهوره وهرس نابێـت تا ئێوه وهرس دهبن . وه خۆشهویسترین كار بهلای پێغهمبهرهوه ﴿ﷺ﴾ ئـهوكردهوه بـووه كهخاوهنهكهی بهردهوام دهبێ لهسهری .

**وعن أبي صالح قال :سالت عائشة. و أمّ سلمة: أي العمل كان أحبَّ الى رسول الله ﴿ﷺ﴾؟ قالتا : ماديم عليه و إن قل)** اخرجه الترمذي (٢٨٦٠) وقال: حديث حسن غريب.

واتـه: پرسیارم كـرد لهعائیشـه و أم سـهلهمه: كـه ئایـا كـام كـردهوه بـهلای پێغهمبـهری خـواوه ﴿ﷺ﴾خۆشهویسـت بـووه؟ فـهرموویان: ئـهوهی كـه خاوهنهكـهی بـهردهوام بێـت لهسهری، ئهگهر چی كهمیش بێت.

# قورئان خوێندنی

**پێغەمبەری خوشەویست ﴿ﷺ﴾ لە کاتی قورئان خوێندندا ئایەتەکانی درێژ دەکردەوە [(١٩٢)] وە لەسەر هەموو ئایەتێك دەوەستا [(١٩٣)] ، وەهەندێ جار دەنگی نزم و کزو هەندێك جاری تر دەنگی هەڵدەبڕی[(١٩٤)] .**

---

(١٩٢)**عن قتاده قال: (قلت لأنس بن مالك: كيف كانت قراءةُ رسول الله ﴿ﷺ﴾ ؟ قال: مَدّاً)**
اخرجه البخاري وابوداود (١٤٦٥) (صحيح ابي داود ) (١٣١٨) وابن ماجه والنسائي .

**واتە: قەتادە دەفەرموێ: بە ئەنەسی کوری مالیکم ووت: قورئان خوێندنەوەی پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ چۆن بووە؟ فەرموی: ئەو پیتانەی شایستەی درێژکردنەوە بونایە درێژی دەرکردنەوە** ./ انظر القسطلاني على البخاري ٧ / ٥٣٥ .

(١٩٣) **عن أمّ سلمة قالت :(كان النبي ﴿ﷺ﴾ يقطع قراءته يقول: ﴿ الحمد لله رب العالمين ﴾ ثم يقف. ثم يقول: ﴿ الرحمن الرحيم ﴾ ثم يقف . وكان يقرأ ﴿ مالك يوم الدين ﴾)** اخرجه الترمذي (٢٩٢٨ ) وابوداود (١٤٦٦) و ( ٤٠٠١) . وقال الالباني : واستغربه الترمذي فهو ضعيف وقد بينت علته في ضعيف ابي داود (٢٦٠) لكن الحديث له طرق كثيرة كما بينت في صفةالصلاة والارواء (٣٤٢) وغيرهما .

**واتە: پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ قورئان خوێندنەکەی پچڕ پچڕ بوو ( ئایەت ئایەت )، دەیفەرموو: (الحمد لله رب العالمين ) پاشان دەوەستا. ئینجا دەیفەرموو( الرحمن الرحيم ) پاشان دەوەستا. وە دەیفەرموو (مالك يوم الدين) [ وە بە(مَلِك)یش هاتووە الترمذي هێناویەتی لە ( كتاب القراءات ). هەردوو شێوازەکەی لێوە ڕیوایەت کراوە بە متواتری].**

(١٩٤) **عن عبدالله بن ابي قيس قال: (سألت عائشة(رضيالله عنها) عن قرآءة النبي ﴿ﷺ﴾ أكان يُسرُّ بالقرآءة أم يجهر؟ قالت:كل ذلك قد كان يفعل، قد كان ربما اسر، وربما جهر. فقلت: الحمد للهِ الذي جعل في الامر سَعَة)** اخرجه مسلم والنسائي وابن ماجه والترمذي (٢٩٢٥) وصححه. وهو مخرج في صحيح ابي داود (١٢٩١) .

**واتە: پرسیام کرد لە عائیشە دەربارەی قورئان خوێندنەوەی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ کە ئایا دەنگی نزم دەکردەوە یان هەڵی دەبڕی ؟ فەرمووی: هەردوو شێوەکەی کردووە، جاری وابووە بە کزی خوێندویەتیەوەو جاری واش بووە دەنگی هەڵبڕیوە. منیش ووتم: سوپاس وستایش بۆ ئەو خوایەی کە مەسەلەکەی فراوان کردووە ومەجالی داوە .**

**وعن أم هانيء قالت: (كنت أسمع قراءة النبيِّ ﴿ﷺ﴾ بالليل وانا على عريشي).** اخرجه النسائي و ابن ماجه فيه وقال الالباني: اسناده حسن صحيح . اخرجه احمد ايضا٦ /٢٤٣ ويشهد له حديث ابن عباس الآتي .

**واتە: بەشەو من گوێم لە قورئان خوێندنی پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ دەبوو لە کاتێکدا من لەسەر جێگاکەم بووم[ ئەمەش لەمەککەدا بوو پێش هیجرەت، لەو کاتەدا کە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ شەو نوێژی دەکرد لەلای کەعبەدا ] .**

**یان بە مامناوەندی دەیخوێند[195]، لەگەڵ ئایەتەکانیشدا ڕۆحی ئاوێتەو تێکەڵاو دەبوو وە دڵی دەدایە[196] وە لە کەمتر لە سێ ڕۆژدا هەموو قورئانی**

---

(١٩٥) **عن ابن عباس (τ) قال: (كانت قراءةُ النبي ﴿ﷺ﴾ ربما يسمعه من في الحُجرَة، وهو في البيت ).** اخرجه ابوداود (١٣٢٧) وقال الالباني: واسناده حسن صحيح كما هو مبين في صحيح ابي داود(١١٩٨).

**واتە: قورئان خوێندنەوەی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بە جۆرێك بوو ئەگەر خۆی لە ماڵەوە بیخوێندایە لەوانەیە ئەوکەسەی کە لە حوجرەکەدا بوایە بیبیستایە[ ئەمەش بەڵگەیە لەسەر مامناوەندی کردنیدەنگ هەڵبڕینی لە قورئان خوێندندا ] .**

**وعن معاوية بن قُرةً قال : سمعت عبدالله بنُ مُغَفَّل يقول :( رأيت النبي ﴿ﷺ﴾ على ناقته يوم الفتح وهو يقرأ: ﴿ انا فتحنا لك فتحا مبينا ليغفرلك الله ماتقدم من ذنبك وما تـاخر ﴾ قـال: فقرأ و رجّع قال: وقال معاوية بن قرة: لولا ان يجتمع الناس علي لأخذت لكم في ذلك الصوت. أو قال: اللّحن )** اخرجه البخاري ومسلم وابوداود ( صحيح ابي داود ١٣٩١ ) .

**واتە: گوێم لێبوو عبدالله ی کوری مُغَفّل دەیفەرموو: پێغەمبەری خوام ﴿ﷺ﴾لە ڕۆژی فەتحی مەککەدا بینی بەسەر وشترەکەیەوە بوو ئایەتی: ﴿ انا فتحنا لك فتحا مبينا . ليغفرلـك الله ماتقدم من ذنبك وما تأخر ﴾ ی دەخوێند[ ئەم ئایەتە مەبەست پێی فەتحی مەککە ،یان خەیبەرە. وەزۆربەی زانایان لەسەر ئەوەن کە سوڵحی حودەیبییەیە ] فەرمووی: [واتە عبدالله ی کوڕی مغفل]: دەیخوێندەوەو دەنگی خۆشی دووبارە پێ دەکردەوە. [شوعبە لە معاویەوە دەگێڕێتەوە ] دەفەرموێ: معاویەی کوڕی قرە فەرمووی: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبێ خەڵکی لێم کۆدەبنەوە لەو دەنگ و ئاوازەم بۆ دەوتن .**

(١٩٦) **عوف بن مالك يقول : ( كنت مع رسول الله ﴿ﷺ﴾ ليلةً فاستاك ثم توضأ ثـم قـام يصـلي، فقمت معه ، فبدأ فاستفتح البقرة . فلا يمر باية رحمة الا وقف فسأل. ولا يَمُرُّ بآية عذاب إلا وقف فتعوّذ . ثم ركع . فكمث راكعاً بقدر قيامه . ويقول في ركوعه : (( سبحان ذي الجبروت والملكوت والكبرياء والعظمة )) ثم سجد بقدر ركوعه ،ويقول في سجوده : ((سبحان ذي الجبروت والملكوت والكبرياء والعظمة)) ثم قرأ ( آل عمران ) ثم سورة سورة ، يفعل مثل ذلك).** اخرجه ابوداود(صحيح ابي داود ) (٨١٧) والنسائي فيه.قال الالباني : اسناده صحيح .

**واتە: شەوێکیان لەگەڵ پێغەمبەردا بووم ﴿ﷺ﴾، سیواکی کردو دەست نوێژی شت و نوێژی دابەست ،منیش لەگەڵی وەستام . دەستی کرد بە خوێندنی سورەتی(البقرة). بگەشتایە بە هەر ئایەتێکی ڕەحمەت دەوەستاو دەپاڕایەوە، وە بگەشتایە بە هەر ئایەتێکی سزا دەوەستاو پەنای دەگرت . پاشان چەمیەوەو ئەوەندەی وەستانەکەی پێچوو دەیفەرموو ( سبحان ذي الجبروت والملكوت والكبرياء والعظمة)پاشان سەجدەی برد بەئەندازەی چەمینەوەکەیوهەمان شتی فەرموو، پاشان سورەتی( آل عمران )ی خوێندەوە. پاشان سورەت سورەت هەمان شتی دووبارە دەکردەوە.**

**نەدەخوێنــدەوە(١٩٧) . وە فەرموویــەتی: دەنگتــان خــۆش بکــەن بــە قورئــان خوێندن(١٩٨) .**

## گریانی

**پێغەمبــەری خۆشەویســت ﴿ﷺ﴾ لــە ترســی خــوای گــەورە لــە نوێــژدا زۆر دەگریا(١٩٩) ، وە کاتێ گوێی لە قورئان دەگرت(٢٠٠) .**

---

( ١٩٧) **( كان لايقرأ القرآنَ في أقل من ثلاثة أيام )** صحيح . رواه ابن سعد .

**واتە: پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ هەموو قورئانی لە سێ ڕۆژدا تەواو نەدەکرد بە خوێندنەوە .**

(١٩٨) **پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ دەفەرموێ: ((زينوا القرآن بأصواتكم ، فإن الصوت الحَسن ، يزيد القرآن حُسنا ))** صحيح رواه ابوداود .

**واتـە: قورئـان برازێنێتـەوە بـە دەنگتـان . چـونکە دەنگـی خـۆش زیـاتر قورئـان جوانترو خۆشتر دەکات .**

(١٩٩)**عبدالله بن الشّخّير قال: ( أتيتُ رسولَ الله ﴿ﷺ﴾ وهو يصـلي ، ولجوفـه أزيـزٌ كـأزيز المِرجَلِ من البكاء ).** اخرجه ابوداود (٩٠٤) واسناده صحيح.وصححه جمع انظر ( صحيح ابو داود ) ( ٨٣٩) .

**واتــە: چــوومە خزمــەت پێغەمبــەری خۆشەویســت ﴿ﷺ﴾ نوێــژی دەکــرد، وە دەگریــا ئەتوت گیزەی مەنجەڵە سینگی دەکوڵا [ ئەمەش بەڵگەی ئەو پەڕی ترسە لە خـوای گـەورە ] .**

(٢٠٠) **عن عبدالله بن مسعود (τ) قال :قال لي رسول الله ﴿ﷺ﴾: (( اقرأ عليَّ )) فقلت: يارسول الله اقرأ عليك وَعليك انزل؟ قال: ((إني اُحـبُّ ان أسمعـه مـن غـيري)) فقـرأت سـورة (النساء) حتى بلغت ﴿ وجئنا بك على هؤلاء شهيدا ﴾ (و في رواية فقال: حسبك الآن) قـال : فرأيت عيني رسول الله تهملان).** اخرجه الترمذي (٣٠٢٨) والشيخان وابو داود والنسائي .

**واتە: عەبدوڵای کوڕی مەسعود دەفەرموێ: پێغەمبــەری خــوا ﴿ﷺ﴾فـەرمووی: قورئـانم بەســەردا بخوێنــە. ووتم: ئــەی پێغەمبــەری خــوا﴿ﷺ﴾ قورئــان بەســەر تــۆدا بخــوێنمو لەکاتێکدا بۆسەر تۆش دابەزیووە؟ فەرمووی: من حەزدەکەم لە غەیری خۆمـەوە بیبیسـتم. منیش سورەتی ( النساء )م بۆ خوێندەوە تا گەیشتمە ئەو شوێنەی کە دەفەرموێ: ئاخۆ حاڵی ئەو کافرانە چی بێت کەلە ڕۆژی دواییدا لـە هـەموو نەتەوەیەك شایەتێك دێنینو تـۆش دێـنین کـە شـایەت بیـت لەسـەر ئـەوان [ ئایـەتی ٤٠ ] ( فـەرمووی: ئـیتر بەسـە ). کە تەماشام کرد دەبینم هەردوو چاوەکانی فرمێسکی لێدەتکێ .**

## وه له كاتی نوێژی خۆرگیراندا[٢٠١]

(٢٠١) **عن عبدالله بن عمرو قال: انكَسَفت الشمسُ يوماً علـى عهـد رسـول الله ﷺ (زاد البخاري: يوم مات ابراهيم فقال الناس: كسفت الشمس لموت ابراهيم) فقام رسول الله يصلي حتى لم يكد يركع. ثم ركع، فلم يكد يرفع راسه، ثم رفع رأسه، فلم يكد أن يسجد، ثم سجد، فلم يكد ان يرفع راسه، فجعل ينفخ ويبكي ويقول: (( ربِّ ألم تعدني ان لاتعـذّبهم و أنـا فـيهم ؟ رب الم تعدني أن لا تعذبهم وهم يستغفرون ، ونحن نستغفرك)) ؟ فلما صلى ركعتين انجلت الشمس ، فقام فحمد الله تعالى واثنى عليه ثم قال: (( إن الشمسَ و القمرَ آيتان من آيات الله لاينكسفان لموت احد ولا لحياته، فاذا انكسفا فافزعوا الى ذكـر الله ))** و في روايـة البخـاري **((فـإذا رأيتموهـا فصـلوا وادعوا)).** اخرجه الترمذي والنسائي وابوداود (١١٩٤) صحيح ابي داود (١٠٩٧) و إرواء الغليل (٢٦٢) وسنده صحيح عند بعضهم وفيه ركوعان في كل ركعة .

واتـه: لەسـەردەمی پێغەمبـەردا ﷺ ئـەو ڕۆژەی (ابـراهیم)ی كـوڕی وەفـاتی كـرد خۆرگیرا [ كە لە ساڵی(١٠)كۆچی بوو] خەڵكی ووتیـان: خـۆر لەبـەر مردنـی ابـراهیم گـیرا. پێغەمبەری خوا ﷺ هەستاو دەستی كرد بە نوێژ كردن ئەتووت ناچەمێتەوە [ئەمەندە درێـژی كـردەوە] پاشـان چـەمیەوە ئـەتوت سـەربەرز ناكاتـەوە. پاشـان سـەری بـەرزكردەوە ئـەتوت سـەجدەنابات. پاشـان سـەجدەی بـرد ئـەتوت سـەربەرز ناكاتـەوە. پاشـان سـەری بەرزكردەوە ئەتوت سەجدە ناباتەوە. پاشان سەجدەی بردەوە .

پاشـان دەگریـا و دەیفـەرموو: پـەروەدگار ئایـا بـەڵێنت نـەداومێ تـا مـن لەناویانـدا بم سزایان نەدەیت؟ پەروەردگار ئایا بەڵێنت نەداومێ هەتا داوای لێخۆشبون بكـەن سـزایان نەدەی؟ ئەوەتا داوای لێخۆشبونت لێدەكـەین. كـاتێ دووڕكـاتی تـەواو كـرد خـۆر بـەربوو بـوو . هەسـتاو سـوپاس و ستایشـی خـوای گـەورەی كـردوو فـەرمووی: خـۆرو مـانگ دوو بەڵگەو نیشانەن لەنیشانەكانی خوای گەورە . لەبەر مردن و ژیـانی كـەس ناگیرێن . ئەگـەر گیران یـادی خـوا بكـەن یـان ( نوێـژ بكـەن و بپاڕێنـەوە ) .[بۆیـە بـە نوێـژ دەوترێـت زیكـرو یادی خوا چونكە زیكری خوای زۆر تێدایە] . [ شێخی البانی دەفەرموویێت بەڵام شێوازی نوێـژی خـۆر گیران لەهـەر ڕكاتێكدا دوو چەمینەوەی تیایـەو ئەمـەی ئێرەكە باس لەیـەك چەمینەوە دەكات شازە ].

وه لـه كـاتـی مردنـی كچـەزاكەیدا (٢٠٢). وه لـه كـاتـی وەفـاتـی هـاوەڵێكی خۆشەویستی خۆیدا دەگریا(٢٠٣) .

---

(٢٠٢) **عن ابن عباس قال: أخذ رسول الله ﴿ﷺ﴾ ابنةً له تقضى فاحتَضَنها بين يديه . فماتت وهي بين يديه، وصاحت أُم أيمن. فقال يعني ﴿ﷺ﴾: ((أتبكين عند رسول الله)) ؟! فقالت: الستُ اراك تبكي؟ قال: ((إني لست أبكي، إنما هي رحمة))** زاد في رواية الصحيحين: **((جعلها الله في قلوب عباده، فانما يرحم الله من عباده الرحماء، ان المؤمن بكل خير على كل حال. ان نفسه تنزع من بين جنبيه وهو يَحْمَدُ الله عزوجل ))**اخرجه النسائي ٤ / ١١ والترمذي، قال الالباني: واسناد الترمذي صحيح . وصححه ابن حبان (٧٤٦) وهو مخرج في الصحيحة (١٦٣٢) .

واته: كچێكی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ لەسەرەمەرگ دابوو[ له ڕیوایەتی النسائیدا هاتووه كه كچێكی بچوك بوو كچی زینەبی كچی بووه كه مێردەكەی ناوی عاصی كوڕی ڕەبیعە بوو، واته كچەزای خۆی بووه، غەیری ئەمەش وتراوه .] .

پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ له باوەشی گرت و خستیيه نیوان هەردوو دەستی ولـه نێوانهـەردوو دەستیدا بوو وەفاتی كرد . ام أيمن هاواری كردو گریا. پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ فـەرمووی: ئـەوه لەلای پێغەمبەری خوادا دەگریت ؟! فەرمووی: ئایا نابینم تۆش دەگریـت ؟ فـەرمووی: من ناگریم بەڵكو ئەمه ڕەحمەتێكه خوای گەوره خستویەتیيه دڵـی بەندەكانیيەوەو خوای گەوره ڕەحم بەبەنـده بەڕەحمـەكان دەكات . ئیمانـدار هـەموو شتێكی هـەر خێره لەسـەر هەموو حاڵێك، وه كاتێ نـەفس و ڕوحیشـی لـەنێوان لاشـەی دەردەهێنرێـت هـەر سوپاسـی خوا دەكات .

[بۆمردنی ابراهیمیش دەیفەرموو: چاو فرمێسك دەڕێژێو دڵ خەمبار دەبێو شتێك نـاڵێین كه خـوای پـەروەردگار ڕازی نـەبێ پێـیو ئێمـەش بـه كـۆچ كـردن و جیابوونـەوەی تۆئـەی ئیـبراهیم خەفتبارین ] .

(٢٠٣) **عن عائشة ( رضیالله عنها ): ( أن رسول الله ﴿ﷺ﴾ قبَّلَ عثمان بن مظعون وهو ميت ، وهو يبكي أو قال : عيناه تُهرقان)** . اخرجه الترمذي (٩٨٩) وقال : حديث حسن صحيح وقال الالباني : وهو كما قـال فـان لـه شواهد تقويه . وابوداود (٣١٦٣) وابن ماجه .

واته: پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ لەكاتی وەفاتی عوسمـانی كوڕی مـەظعونـدا بـه مردووی ماچی كردو هەردوو چاوی پڕبوو له فرمێسك [ئەمەش بەڵگەيەكه لەسـەر دروسـتێتی مـاچ كردنـی مـردووی صـالح، وەك چـۆن ابـوبكر پێغەمبـەری﴿ﷺ﴾ بـەمردووی مـاچ كـردوو فـەرموی : (**طبت حيا و ميتا بأبي أنت و أُمـي** ) بـه زینـدوویی و بـەمردوویی هـەر پـاك بوویـت باوكو دایكم بـه فیدات بن . پاشان ئەو ئایەتەی خوێندەوه ﴿ انك ميت وإنهم ميتون.. ﴾] .

وه له كاتی مردنی كچەكەی‌دا[٢٠٤]

## پێخەفی نوستنی

پێخەفی نوستنی پێغەمبەر (ﷺ)و دۆشەكەكەی لە چەرم دروست كرابوو ناوەكەی پووشی دارخورما بوو[٢٠٥] یان لەقوماشێكی زبر دروست كرابوو[٢٠٦]

---

(٢٠٤) **عن انس بن مالك قال: (شهدنا ابنة لرسول الله (ﷺ)ورسول الله جالس على القبر ، فرأيت عينيه تدمعان ،فقال: ((أفيكم رجل لم يُقارفِ الليلة ؟ قال ابو طلحة: انا، قال: ((انـزل)) فنزل في قبرها ).**اخرجه البخاري وغيره انظر احكام الجنائز . ص (١٤٩) .

**واتە: ئامادەیی بەخاك سپاردنی كچێكی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بووین [ئەویش ام كلثوم ی خێزانی عوسمانی كوڕی عەفانە] پێغەمبەریش (ﷺ) لەسەر گۆڕەكەی لە لایەكەوە دانیشتبوو بینیم هەردوو چاوی فرمێسكی لێ دەتكا. فەرمووی: پیاوێكتان تیایە كە ئەمشەو جیماعی نەكردبێ لەگەڵ خێزانی‌دا؟ ابو طلحة فەرمووی: من، فەرمووی: تۆ دابەزەرە ناو گۆڕەكەوە، ئەویش دابەزی‌یە گۆڕەكەی .**

**[ابو طلحة: ناوی زەیدی كوڕی سەهلی ئەنصاری خەزرەجی نەجاری‌یە، بەشداری عەقەبەو هەموو ڕووداوەكانی تر بووە . پێغەمبەریش (ﷺ) دەیفەرموو: دەنگی ابو طلحه لەسوپادا لەسەد پیاو چاكترە. لە ڕۆژی حونەین دا بیست پیاوی كوشت، باخێكی هەبوو ناوی بەیرەحاء بوو كردی بەخێر. مامی ئەنەس‌و مێردی ام سليم ی دایكێتی. دەڵێن لە دەریادا لە كاتی غەزادا وەفاتی كردوە** / انظر تهذيب الأسماء للنوي .

(٢٠٥) **عن عائشة (رضي الله عنها) قالت: ( انما كان فراشُ رسول الله (ﷺ) الذي ينام عليه من أدَمَ حشوُه ليف).** اخرجه مسلم (٢٠٨٢) والترمذي (١٧٦١) وابوداود(٤١٤٧) وابن ماجه بنحوه وكذا البخاري.

**واتە: پێخەفی نوستنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) كە لەسەری دەنوست لە پێستە دروست كرابوو ناوەكەی پووشی دارخورمای تێدابوو .**

(٢٠٦) **وەلە ( الجامع الصغير ) دا هاتووە: ( كان فراشه مِسْحاً )** اخرجه الترمذي في الشمائل عن حفصة ولم يذكر غيره .

**واتە: پێخەفەكەی (مسح) بوو [ كە پۆشاكێكی زبرە تایبەتە بۆ داخستن‌و پێخەف، لە موو دروست دەكرێت] .**

# خۆبەكەم زانین و تەواضعی

دەیفەرموو لە پلەی خۆم زیاد بەرزم مەكەنەوە(٢٠٧) ، لەگەڵ ئافرەتیشدا دادەنیشت هەتا پێویستیەكانی بۆ جێ بەجێ بكات(٢٠٨)،كە دەعوەت دەكرا دەچوو ئەگەر بانگ هێشتیش بكرایە بۆ ڕۆنی كۆن بوو(٢٠٩) .

---

(٢٠٧) **عن عمر بن الخطاب قال : قال رسول الله ﴿ﷺ﴾:((لا تُطروني كما أطْرَت النصارى ابن مريم . إنما أنا عبد . فقولوا : عبدالله ورسوله))** اخرجه البخاري والدارمى ٢ / ٣٢٠ واحمد والنسائي والبغوي .

واتە: زۆر مەدحم مەكەن [یان زیادە ڕۆیی مەكەن لە مەدح كردنم دا] هەروەك چۆن گاورەكان زیادەڕۆیان كرد لە عیسای كوڕی مریم دا ( كە دەڵێن كوڕی خوایە- پەنا بە خوا-) ،بەڵكو من بەندەم . بڵێن بەندەو نێردراوی خوایە.[هەرچەندە مەدح كردن دروستە بەڵام نەهی لێدەكرێ لەبەر(سد الذريعة) تا پێچەوانەی شەرعی تێدا ڕونەدات] .

(٢٠٨) **عن انس بن مالك (τ): أن إمرأة ( من الانصار كما في البخاري،وفي رواية: ومعها صبي لها ) جاءت الى النبي ﴿ﷺ﴾ فقالت له : إن لي إليك حاجة . فقال : ((إجلسي في أيِّ طريق المدينة شئتِ أجلسْ اليك )) (** وفي رواية مسلم زيادة **: فخلا معها في بعض الطريق حتى فرغت من حاجتها).** اخرجه البخاري معلقا مختصرا ووصله واما مسلم فوصله (٧٦) وابو داود وابو الشيخ واحمد.

واتە: ئافرەتێكی ئەنصاری مناڵێكیشی پێ بوو هاتە خزمەت پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾و عەرزیكرد : كارو پێویستیەكم پێتە . ئەویش فەرمووی : لەهەر ڕێگایەكی مەدینەدا حەز دەكەیت دانیشە لەگەڵت دادەنیشم . پاشان لەگەڵی دانیشت هەتا پێویستیەكەی تەواوكرد[مەبەست لە دوور خستنەوەكە ئەوەبووە هەتا كەسی تر شكاتی حاڵی نەبیستێ ]

(٢٠٩) **عن انس بن مالك (τ)قال : ( كان النبي ﴿ﷺ﴾ يدعى الى خبز الشعير والاهالة السَّنِخه فيجيب ، ولقد كان له دِرْعٌ عند يهودي فما وجد ما يَفُكّها حتى مات )** اخرجه الترمذي (١٢١٥) والبخاري (١٠٤٦) وغيرهم .

واتە: پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ دەعوەت دەكرا بۆ نانی جۆو ڕۆنی توندی بۆن گۆڕاو لە كۆنیدا وەڵامی دەدایەوەو دەچوو. وەزرێیەكی ئاسنی هەبوو [ناوی ذات الفضول بوو] لای كابرایەكی جولەكە داینابوو بە ڕەهن [ كابراكە ناوی ابو الشحم اليهودی بوولە بنی ظفر كەهۆزو تیرەیەكی بچووكن لە ئەوس و هاوپەیمانیان بوو، لە جیاتی(٣٠) صاع لە جۆ (وەك بوخاری وابن ماجە و طەبەرانی وغیری ئەو ڕیوایەتیان كردوە ) وابن حبان ڕیوایەتی كردوە كە كاتەكەشی بۆماوەیساڵێك بووە ] بەڵام پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ نەیتوانی بیداتەوەو پێش تەواو بوونی كاتەكەی وەفاتی كرد. [وە ابو بكر وەری گرتەوە چونكە هەموو قەرزەكانی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ ئەو دایەوە. ] [ ئەمەش بەڵگەیە لەسەر: دروستێتی مامەڵەكردن لەگەڵ بێبڕوادا لەگەڵ ئەوەشدا دەشزانرێ كاسپیو مامەڵەیان پیسە، وە دروستە سیلاح ڕەهن بكرێو بدرێ بەكرێ و بفرۆشرێ بە كافری موسالیم وبێوەی، وە ڕەهن كردن دروستە تا كاتێكی دیاری كراو لە ئامادەییدا ].

هەندێك جار كراسێكی لەبەر دەكرد چوار درهەمی نەدەكرد[٢٣٠]. وەحەزی نەدەكرد كەس لەبەری هەستێت[٢٣١] . ئەگەر قۆڵی مەڕێكی بۆ بهێنرایە بەدیاری وەری دەگرت[٢٣٢]. وە بە پیادەیی دەچوو بۆ سەردانی كردن[٢٣٣].

---

(٢٣٠) **وعنه (τ) قال:(حَجّ رسول الله ﴿ﷺ﴾ على رَحلِ رَثٍّ ، وعليه قطيفةٌ لا تُساوي أربعة دراهم . فقال: (( اللهم اجعله حَجاً لا رياءَ فيه ولا سُمعة)).** وفي رواية: **( كنا نرى ثَمَنَها أربعة دراهم، فلما استوت به راحلته قال :(( لبيك بحجةٍ لاسُمعه فيها ولا رياء / ٣٣٣))** اخرجه الترمذي وابن ماجه واسناده ضعيف . لكن رواه الضياء في (المختارة) من طريق اخرى عن انس . وله شاهد عن ابن عباس . كل ذلك مخرج في الصحيحة (٢٦١٧) .

واتە: پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾لەسەر كۆپانێكی كۆن بەسەر پشتی ووشترێكەوە بەسواری حەجی دەكردو پۆشاكێكی لەبەردا بوو چوار درهەمی نەدەكردو دەیفەرموو : خوایە حەجێكی پاكی بێ ڕیابێتو تەنها لەبەر خاتری تۆ بێت .

(٢٣١) **وعنه ايضا (τ)قال:(لم يكن شخصٌ احب اليهم من رسول الله ﴿ﷺ﴾، قال : وكانوا إذا رأوه لم يقوموا لما يعلمون من كراهته لذلك)** اخرجه الترمذي (٢٧٥٥) وقال : حديث حسن صحيح وهو على شرط مسلم ،والبخاري (٩٤٦) وغيره .

واتە: هیچ كەسێك نەبووە ئەوەندەی پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ بەلای هاوەڵانەوە خۆشەویست بووبێتو لەگەڵ ئەوەشدا كاتێك دەیان بینی لەبەری هەڵنەدەستان چونكە دەیانزانی پێی ناخۆشە .[ بەجۆرێ خۆشیان دەویست وازیان لە وڵات هیناو جەنگیان لەگەڵ باوكو كوڕو عەشیرەتیاندا دەكرد لەگەڵی، بەجۆرێ أبا عوبەیدە باوكی خۆی كوشتو موصعەب براكەیوعومەر خاڵی خۆی كوشت].

(٢٣٢) **وعنه ايضا (τ) قال : قال رسول الله: ((لو أُهدي إليّ كُراعٌ لقَبلتُ، و لو دُعيتُ عليه لأجبت ))** . اخرجه الترمذي (١٣٣٨) وقال: حديث حسن صحيح . واخرجه البخاري واحمد من حديث ابي هريرة، واحمد ايضا ٣ / ٢٠٩ عن انس .

واتە: ئەگەر قۆڵی بزن یان مەڕێكم بەدیاری بۆ بنێرن وەری دەگرمو ئەگەر دەعوەتیشم بكەن بۆی دەچم .

(٢٣٣) **عن جابر (τ)قال :(جاءني رسول الله ﴿ﷺ﴾ ليس براكبِ بغلٍ ولابرذون )**. اخرجه الترمذي (٣٨٥٠) وقال : حسن صحيح، والبخاري وابوداود .

واتە: پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ هات بۆلام وسەردانی كردم بەپیادەیی، بەجۆرێ نەسواری هێستر بوو بوو نەماین(كە لە ئەسپ گەورەترە) [ لەبەرئەوەی پیادەیی پاداشتی زۆرترە ]

**واخرجه البخاري عن جابر: ( أتاني رسول الله يعودني وابوبكر وهما ماشيان ) .**

واتـە: پێغەمبـەری خـوا ﴿ﷺ﴾ و ئەبوبـەکر سـەردانیان کـردم مـن نـەخۆش بـووم بـە پیادەیش هاتن .

**وە نـەهی کـردووە لـە زۆر ڕابـواردنو فـەرمانی کـردوە هەنـدێ جـار بـە پـێ خاوسی بڕۆن بەڕێدا[٢٣٤] .دەستی بەسەری منداڵاندا دەهێناو ناوی دەنانو سـەردانی دەکـردنو سـڵاوی لێـدەکردن ودوعـای خێـری بـۆدەکردن[٢٣٥] ،لـە ماڵیشـەوە وەکـو کەسێکیئاسـایی وابـووەوجلی خۆیدەشـت و دەدوریـەوەو مـەڕی دەدۆشـیو خزمـەتی خۆیوکـەس وکـاری دەکـرد[١٣٦] ، بـەڵام کـە کـاتی**

---

(٢٣٤) **( كان ينهانا عن كثير من إلارفاه ) (كان رسول الله ﴿ﷺ﴾ يأمرنا ان نحتفي أحياناَ).** رواه ابوداود . وصححه الالباني في المشكاة .

واتە: پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ نەهی لێ کردوین کە زۆر لە ڕابوارندا بژین، وە فەرمانی پێ کردوین کە هەندێ جار بە پێخاوسی بێین وبچین [ئەمیش بۆ دەرخستنی تەواضع ونەهێشتنی کیبرە ]

(٢٣٥) **يوسف بن عبد الله بن سلام قال:(سمّـاني رسـول الله ﴿ﷺ﴾ يوسـف، وأقعـدني في حجره، ومسح على رأسي).** اخرجه الترمذي، قال الالباني : اسناده صحيح رجاله كلهم ثقات ، واخرجه احمد٤ / ٣٥ و ٦ / ٦ وعزاه في الاصل للطبراني فقط !وذكر انه زاد في آخره :**(ودعا له بالبركة )** .

واتـە: یوسـف ی کـوڕی عبـدالله ی کـوڕی سـەلام [ کـە هـاوەڵێکی بچوکەو کـوڕی ئـەو عبداللهی کوڕی سەلامەیە کە مژدەی بەهەشتی پێدراوە] دەفەرمویت : پێغەمبـەری خـوا ﴿ﷺ﴾ ناوی نام (یوسف)و لەباوەشیدا داینامو دەستی هێنا بەسەرم دا، لەڕیوایـەتی طەبرانیدا دەفەرموێ: وەپاڕایەوە بۆی بەبەرەکەت .

وە لەفەرموودەی تردا هاتووە کە: **(كان يزور الانصار، ويسلم على صبيانهم، و يمسح رؤسهم)**. صحيح رواه النسائي .

واتە: پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ سەردانی ئەنصارەکانی دەکردو سڵاوی لەمناڵەکانیان دەکردو دەستی دەهێنا بەسەریاندا .

**وعن انس:(ان رسول الله ﴿ﷺ﴾ مَرَّ على صبيان يلعبون فسلَّم عليهم )** رواه مسلم .

واتـە: پێغەمبـەر ﴿ﷺ﴾ بـەلای کۆمـەڵێك لـە منداڵانـدا تێپـەڕی یاریـان دەکـرد سـڵاوی لێکردن .

(٢٣٦) **عن عَمرَة قالت: قيل لعائشة: ماذا كان يفعل رسول الله ﴿ﷺ﴾ في بيته؟ قالت (كان بشرا من البشر، يَفلي ثوبه، و يحلُبُ شاته، ويَخدِم نفسه).** اخرجه الترمذي (٢٤٩١) وعنده: (**يكـون في مهنة اهله**) والبخاري وتمامه عندهما ( **فاذا حضرت الصلاة قام فصلى** ) مختصر البخاري (٣٧٣) انظر الصحيحة (٦٧١).

واتە: لە عائیشەیان پرسی: پێغەمبـەری خـوا ﴿ﷺ﴾ لەماڵـەوە چـی دەکرد؟ فەرمووی: هەروەکو هەموو مرۆڤێکی تر مرۆڤ بوو. کراسی خۆی دەدوریەوەو مەڕی خۆی دەدۆشیو

خزمەتی خۆی دەکرد. (لەڕیوایەتەکەی تردا: خزمەتی کەس و کاری دەکرد) کە کاتی نوێژ دەهات هەڵدەستا نوێژەکەی دەکرد.

**نوێژ دەهات دەردەچوو بۆ نوێژەکەی(٢٣٧) . وە سەردانی هەژارو نەخۆشی دەکردو بەشداری جەنازەیان دەبوو(٢٣٨). ذیکرو یادی خوای گەورەی زۆر دەکردو قسەی بێ هەدەری نەدەکردو خۆی بە گەورە نەدەزانیو لەگەڵ بێوەژنو هەژارو کەنیزەکدا دەڕۆیشت بە ڕێگادا(٢٣٩).**

---

(٢٣٧) وە لە ئەسوەدی کوڕی یەزیدی النخعییەوە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: پرسیارم کرد لەعائیشە کە ئایا پێغەمبەری خوا (ﷺ) چی کردوە لەماڵەوە؟ فەرمووی ( **يكون في مهنة اهله ، فاذا حضرت الصلاة يتوضأ. ويخرج الى الصلاة** ) رواه البخاري .

واتە: خەریکی خزمەت کردنو کاروباری خێزانو کەس و کاری دەبوو، تا کاتی نوێژ دەهات ئەوجا دەست نوێژی دەشتو دەچوو بەرەو نوێژەکە .

**وعن عائشة(رضيالله عنها )قالت: ( كان رسول الله (ﷺ) يخصف نعله، ويخيط ثوبه، ويعمل في بيته كما يعمل احدكم في بيته، وقالت: كان بشرا من البشر يُفلّي ثوبه ويحلب شاته ويخدم نفسه)** رواه الترمذي وصححه الالباني .

واتە: پێغەمبەریخوا(ﷺ) نەعلو جلی خۆی دەدوریەوە لە ماڵەوە کاری دەکرد هەروەکو چۆن یەکێك لە ئێوە لەماڵەوە ئیش دەکات.........

(٢٣٨) **(كان يأتي ضعفاء المسلمين ويزورهم ويعود مرضاهم ، ويشهد جنائزهم)**صحيح رواه ابو يعلي

واتە: پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەچوو بۆلای موسڵمانە هەژارو لاوازەکانو سەردانی دەکردنو نەخۆشەکانی بەسەردەکردەوەو ئامادە دەبوو لەبەڕێ کردنی مردووەکانیان دا.

(٢٣٩) **( كان يكثر الذكر، و يُقلُّ اللغو، ويطل الصلاة، ويقصر الخطبة، وكان لايأنف ولايستكبر أن يمشي مع الأرملة والمسكين، والعبد، حتى يقضي له حاجته )** صحيح رواه النسائي

واتە: زۆر یادی خوای دەکردو قسەی بێ هەدەری نەدەکردو نوێژی درێژ دەکردەوەو وتارەکانی کورت بوونو خۆی بە گەورە نەدەزانیو بێزی نەدەکردەوە لەوەی لەگەڵ بێوەژنو هەژارو بەندەدا بڕۆیشتایە . هەتا پێویستییەکەی بۆجێبەجێ دەکرد .

**وعن انس بن مالك (τ) قال: (إن كان الأمة لتأخذ بيد رسول الله (ﷺ) فتنطلق به حيث شاءت)** رواه البخاري .

واته: جاری وابووه ئافرەتێکی کەنیزەکی بچوك دەستی پێغەمبەری خوای ﴿ﷺ﴾ دەگرت‌و دەیبرد بۆ هەر شوێنێك بیویستایە.

وه لۆمەو سەرزەنشتی خزمەتکاری نەدەکرد[٢٤٠] . باڵی سۆزی ڕادەخست بۆ ئیمانداران [٢٤١] ، کەسیان لێ دوورنەدەخستەوە تابچێتە خزمەتی [٢٤٢] وه لە سەفەردا خێرا نەدەڕۆیشت تا لاوازەکان بەکەس و کاریان بگەنەوە[٢٤٣] . داوای هەرچی لێکرابێ نەیفەرمووە (نەخێر)، گەر هەبوبێ داویەتی یان بێ‌دەنگ بووە [٢٤٤]

---

(٢٤٠) **وعن انس قال : ( خدمت رسول الله ﴿ﷺ﴾ وانا ابن ثمان سنين ، فما لامني على شيء قط أُتي فيه، فإن لامني لائم من أهله قال: ((دعوه ، فانه لو قضي شيء كان ))** رواه البيهقي وصححه الالباني .

واته: ئەنەس دەفەرمووێ : من هەشت ساڵان بووم کەخزمەتی پێغەمبەرم ﴿ﷺ﴾ دەکرد [ بۆماوەی (دە) ساڵ ] هەرگیز لۆمەو سەرزەنشتی نەکردووم لەسەر شتێك کە کردبێتم‌و زەرەرێك دابێتم . خۆ ئەگەر یەکێك لەکەس‌و کارەکەی لۆمەی بکردمایە . دەیفەرموو : وازیلێ بهێنن ، هەرشتێك بڕیاری خوایی لەسەر درابێت ڕوودەدات .

(٢٤١) خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ واخفض جناحك للمؤمنين ﴾ الشعراء .

واته: باڵی سۆز دابنێ بۆ ئیمانداران.

(٢٤٢) **( كان لا يدافع عنه الناس ولايضربوا عنه )** صحيح رواه الطبراني .

واته: هەرگیز خەڵکیان لێ‌دوور نەدەخستەوە وپاڵیان بە خەڵکەکەوە نەدەناو بەلێدان لە خەڵکیان نەدەدا تادەوری چۆڵ بکەن .

(٢٤٣) **( كان يتخلف في المسير ، فيزجي الضعيف ، ويردف ، ويدعو لهم )** صحيح رواه ابوداود .

واته: لەکاتی ڕۆیشتندا بە کاروانی بەرەو سەفەرێك دوا دەکەوت و کەسە لاوازەکانی پێش خۆی دەدا تابگەنەوە بەکەس‌و کارەکانیانداو بەسەر وولاغەوە کەسی تری لەپشتی خۆیەوە سەردەخست و دەپاڕایەوە بۆیان .

(٢٤٤) **( كان لايسأل شيئا الا اعطاه، او سكت )** صحيح رواه الحاكم .

**واته: دوای هیچ شتێكی لێنەكراوه ئیلا بەخشیویەتی یان گەرنەیبووبێ بێدەنگ بووه .**

## سـوبعەتی لەگـەڵ ئافرەتانیشـدا دەكـرد .(٢٤٥) بـە تایبـەتی لەگـەڵ خێزانەكانیدا سوبعەت و یاری (٢٤٦) .

---

(٢٤٥) **( كان يُلاعب زينب بنت أم سلمة ويقول : ((يازوينب ، يازوينب مرارا))** صحيح رواه الضياء .

**واته: سوبعەتی لەگەڵ زەینەبی كچی ام سلمەدا دەكردو چەند جارێك دەیفەرموو ئـەی (زوەینیـب) واتـە: زەینەبۆچـكە [ دیـارە ئافرەتـانیش زۆر پێیـان خۆشـە بەناوێكی بچوك و گەنجانەوە بانگیان بكرێت !! ] .**

**(٢٤٦) ڕۆژێكیان لەسەرەتای ژن هێنانیەوە(لە سەفەرێكدا) پێش كەوتنی لەگەڵ عائیشـەدا كـرد(رەزای خـوای لێ بێت)،بـەوەی بـە هاوەڵـەكانی فـەرموو ئێـوە پـێش بكەون، پاشـان بـە عائیشـەی فـەرموو بـا پێشـبڕكێ بكـەین تـا بـزانین كاممـان زووتـر دەگەینـەوە بـە كاروانەكـەدا، عائیشـەش فـەرمووی نـاتوانم، بـەڵام پێغەمبـەری خـوا فەرمووی: دەتوانیت، ئەوە بوو عائیشـە پێشـی پێغەمبـەری ﴿ﷺ﴾ دایـەوە، پاشـان دوای ئـەوەی عائیشــە قەڵــەو بــوو پــێش كــەوتنی لەگەڵــدا كــردەوەو ئــەمجارە پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ پێشی دایەوە. بۆیـە فـەرمووی:(( یاعائشة هذه بتلـك)) . واتـە: ئـەی عائیشە ئەم جارە بەو جارە (واتە: حەق بـە حـەق !!)** . اخرجـه ابـوداود (٢٢١٤) واحمـد ٦ / ٣٩ ، ٢٦٤ .

**ابن القیم فەرمویەتی: پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ بەهەڵپە دەرچووە لەگەڵیدا بەرەو دەرگاكە بەشێوەی یاری كردن و سوبعەت/**. زاد المعاد ١ /١٥٢.

**وە هەندێك جاریش بانگی كـردووە: ((یا عـائش )) ئـەی عائیشۆچكە** / البخـاري ٣ / ١٣٧٤ و ٢٢٩١ ومسلم ٤ / ١٨٩٦ واحمد .

# هەندێك لە ئاكارو ڕەوشتە بەرزەكانی

لــە كــاتی قســەكردندا ڕووی دەكــردە خراپترینــی خــەڵكیش تــا دڵیــان ڕابكێشی[٢٤٧]. سەرزەنشتی كەسی نەدەكرد لەسەر شتی دنیایی و جوانترین ڕەوشتی هەبووە ، دەستی لە لۆكەو ئاوریشم نەرمترو بۆنی ئارەقەی لەشی پیرۆزی لەعەترو میسك خۆشتر بووە [٢٤٨] كردەوە ناشرین ودەم پیس نەبووەو

---

(٢٤٧) **عن عمرو بن العاص قال :(كان رسول الله ﷺ يقبل بوجهه وحديثه على اشرّ القوم ، يتألّفهم بذلك، فكان يقبل بوجهه وحديثه علي، حتى ظننت اني خير القوم(فقلت: يارسول الله! أنا خير أو أبوبكر؟ قال((أبوبكر)) ) فقلت:يارسول الله! أنا خير أو عمر؟ فقال: ((عمر)) فقلت: يارسول الله! انا خير او عثمان؟ قال: ((عثمان))، فلما سألت رسول الله ﷺ فصدَّقني ، فلوَددتُ اني لم اكن سالته )** اخرجه الترمذي (٣٨٠) مختصرا ومسلم (٢٣٨٥) والبخاري بنحوه : قال الالباني : مااخرجه هؤلاء غير هذا ، فانه ليس فيه منه (الا ان ابابكر خير الرجال ). ولذلك اورده الهيثمي في ( المجمع ) من رواية الطبراني وحسن اسناده وهو كما قال ان كان ابن أسحاق قد صرح فيها بالتحديث ، فانه قد عنعنه هنا . لذلك خرجته في الضعيفة (١٤٦١) .

واتـە: پێغەمبـەری خـوا ﷺ ڕووی قسـەی دەكـردە خـراپترین كەسیش وبەمـە دڵـی ڕادەكێشان ، وەڕووی قسەی دەكردە من، بەجۆری وا گومانم دەبرد كەمن چاكترین كەسی ئەو مەجلیسەم، ووتم: ئەی پێغەمبەری خوا، من چاكترم یان ابوبكر؟ فەرمووی: ابوبكر. ووتم: ئـەی پێغەمبـەری خـوا! ئـەی مـن چاكترم یـان عومـەر؟ فـەرموی: عومـەر. ووتم :ئـەی پێغەمبـەری خـوا! مـن چاكترم یـان عوسمـان؟ فـەرمووی: عوسمـان. كـاتێ بینـیم پرسـیارم كردو پێغەمبەری خواش ﷺ بەڕاستی وەڵامی دامەوە . ئاواتم ئەخواست كە پرسیارم لێنەكردایە .

(٢٤٨) **عن انس بن مالك ﷺ قال :(خَدَمتُ رسول الله ﷺ عشرَ سنين ، فما قال لي اُفٍ قَطّ. وما قال لي لشيء صنعته: لم صنعته، ولا شيء تركته: لم تركته. وكان رسول الله ﷺ من احسنِ الناسِ خلقا . ولا مَسَسْتُ خزاً . و لا حَريراً ولا شيئاً ألين من كَفّ رسول الله ﷺ، ولا شممتُ مِسكاً قط ولاعطراً كان أطيب من عرق النبي ﷺ)** . اخرجه الترمذي (٢٠١٦) وقال: حديث حسن صحيح . والبخاري ومسلم .

واتە: (دە) ساڵ خزمـەتی پێغەمبـەری خـوام ﷺ كـرد. هـەرگیز پێـی نـەوتووم ئـۆف. وە هـەر شـتێكم بكردایـە نەیفـەرمووە: بۆچـی وات كـرد. وەهەرشـتێكم واز لێبهاوردایـە.

نەیدەفەرموو: بۆچی وازت لێهێناو نەتکرد، وە لە هەموو کەسێك ڕەوشت جوانتر بووە. دەستم نەداوە لە هیچ خز [ کە پۆشاکێکە لە لۆکەو ئاوریشم دروست دەکرێت ] و ئاوریشمێك نەرمتر بوبێت لە دەستی پێغەمبەر ﷺ، وە بۆنی هیچ میسكو گوڵاویکم نەکردووە لە بۆنی ئارەقەی پێغەمبەر ﷺ خۆشتربووبێت .

لە بازاڕو شوێنی قەرەباڵغدا دەنگی بەرز نەدەکردەوەو بە خراپە وەڵامی خراپەی نەدەدایەوە، بەڵکو لێی دەبوورا[٢٤٩]. لە کەسی نەداوە، نە لە خزمەتکارو نە لەخێزانەکانی، مەگەر لەکاتی جیهاد کردندا لە پێناوی خوای گەورەدا لە خەڵکی دابێ. وە هەرگیز لەسەر خۆی تۆڵەی لەکەس نەدەسەندەوە، بەڵام ئەگەر بیبینیایە سنورێکی خوای گەورە پێشێل دەکرێ، ئەو کاتە لە هەموو کەس زیاتر توڕە دەبووە[٢٥٠] ئەگەر سەرپشك بکرایە بۆ کردنی دووکار ئەوا ئاسانەکەیانی هەڵدەبژارد بەمەرجێ تاوان و گوناه نەبوایە[٢٥١]

---

(٢٤٩) **عن عائشة أنها قالت: (لم يكن رسول الله ﷺ فاحشاً ولامتفحِشاً، ولا صخّاباً في الأسواق، ولا يَجزئ بالسيئة، ولكن يعفو ويصفح ﴾** اخرجه الترمذي(٢٠١٧)وقال: حديث حسن صحيح والطيالسي واحمد وسنده صحيح . وللشطر الاول منه شواهد عند ابي الشيخ ص ٣٧ .

واتە: هەرگیز پێغەمبەری خوا ﷺ قسەو (کردارو سیفاتو ئاکار) ناشرینو خۆ ناشرین کارنەبووە، وە لەبازاڕدا دەنگ بەرزو دەنگ ناخۆش نەبووەو خراپەی بە خراپە وەڵام نەداوەتەوە بەڵکو لێی دەبورا .

(٢٥٠) **عن عائشة ( رضيالله عنها) قالت: ( ما ضَرَبَ رسول الله ﷺ بيده شيئا قط إلا أن يجاهد في سبيل الله، ولا ضَرَبَ خادماً و لا إمرأة).** رواه مسلم (٧٩) والدارمي واحمد وغيرهم .

واتە: هەرگیز پێغەمبەری خوا ﷺ بەدەستی خۆی لە هیچ شتێکی نەداوە، مەگەر لەکاتی جیهاددا لەڕێگای خوای گەورە ، وە هەرگیز نە لە خزمەت کارو نە لە خێزان و ئافرەتی نەداوە .

(٢٥١) **وعنها قالت: (ما رأيتُ رسول الله ﷺ مُنتصراً من مظلمةٍ ظلمها قَطُّ مالم ينتهك من محارم الله شي. فاذا انتهك من محارم الله شي كان من اشدهم في ذلك غضبا، وما خُيّر بين امرين الا اختار ايسرهما، مالم يكن مأثما).** اخرجه الترمذي والبخاري ومسلم وابوداود (٤٧٨٥) واحمد وابو الشيخ .

واتە: هەرگیز پێغەمبەری خوام ﷺ نەبینیوە کە ستەمی لێکرابێو توڕە بووبێو تۆڵەی سەندبێو لەسەرخۆی کردبێتەوە مادامێك سنوری حەرامکراوەکانی خوای گەورە

پێشێل نەکرابێ . بەڵام کاتێ حەرام کراوەکانی خوای گەورە پێشێل دەکرا لەهەموو کەسیان زیاتر توڕە دەبوو تۆڵەی لێدەسەند. وە هەرگیز سەرپشك نەکراوە لەنێوان دووکاردا ئیلا ئاسانەکەیانی هەڵدەبژارد مادام تاوان نەبووبێ .

**وە لەگەڵ تاوانبارو خراپەکاراندا نەرم بووە تا موسڵمان بن[(٢٥٢)] وە زۆر ڕقی لەدرۆکردن بووە[(٢٥٣)] .جوانترین ڕەنگ بەلایەوە ڕەنگی سەوز بووە[(٢٥٤)] .**

---

(٢٥٢) **وعنها (رضي الله عنها) قالت:(استأذن رجلٌ على رسول الله ﴿ﷺ﴾ وأنا عنده ، فقال: (( بئس ابن العشيرة (او) أخو العشيرة )) . ثم أذن له ، فلما دخل الآن له القول، فلما خرج قلت: يارسول الله قلت ماقلت ثم ألنت له القول : فقال:(( ياعائشة إن من شر الناس من تركها لناس أو ودعه الناس اتقاء فُحشه ))** اخرجه الترمذي (١٩٩٧) وقال : حديث حسن صحيح . والبخاري ومسلم (٢٥٩١) وابو داود واحمد .

**واتە: کابرایەك ئیزنی هاتنە ژوورەوەی لە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾خواست و منیش لە خزمەتیدا بووم، فەرمووی: ئەمە خراپترین نەوە یان برای عەشرەتەکەیە [بە بێ شك لای بوخاری فەرموی بە ابن العشیرە هاتووە]. پاشان ئیزنی پێدا. کاتێ هاتە ژوورەوە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بە نەرمی قسەی لەگەڵ کرد [ چونکە سەرۆك هۆز بوو تاموسڵمانان ببێت و گەلەکەشی موسوڵمان بن ] [دوای ئەوەی ڕۆشت ]ووتم: ئەی پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ پێشتر ئاوات فەرموو پاشان نەرم بوویت لەگەڵی!! . فەرمووی: ئەی عائیشە لە خراپترینی خەڵکی ئەو کەسەیە کە خەڵکی خۆی لێ بەدوور دەگرن و خۆی لێ دەپارێزن لەبەر سەلامەت و ئەمین بوون لە خراپەی .**

(٢٥٣) **( كان أبغضُ الخُلُق إليه الكَذب )** . صحيح جامع الصغير مجلد(٤) رقم (٤٤٩٤) .

**واتە: ڕقاوی ترین و بوغزاوی ترین ڕەوشت بەلایەوە بریتی بووە لەدرۆکردن .**

**(وكان إذا اطلع على احد من اهل بيته كذب كذبة ، لم يزل مُعرضاً عنه حتى يحدث توبة)** صحيح رواه احمد

**واتە: ئەگەر درۆیەکی ببیستایە لە یەکێك لە خێزانەکەیدا ئەوا ڕووی وەرئەگێڕا لێیان وتوڕە ئەبوو هەتا پەشیمان دەبوونەوەو تەوبەیان دەکرد.**

(٢٥٤) **( كان أحبُّ الألوان اليه الخُضرة )** صحيح جامع الصغير مجلد(٤) رقم (٤٤٩٩) .

**واتە: جوانترینو خۆشەویست ترین ڕەنگ بەلایەوە سەوزایی بووە .**

وه پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ مامۆستای مرۆڤایەتی بووه[٢٥٥] لەگەڵ خەڵكدا زۆر نەرم بووه[٢٥٦].

---

(٢٥٥) دەفەرمویَ: **((إن الله لم يبعثني مُعَنِّتاً ولا مُتعَنِّتاً ، ولكن بعثني مُعلماً ومُيسراً))** رواه مسلم.

**واته: خوای گەورە ڕەوانەی نەكردووم تا تانەو تەشەردەرو دەم شڕبم. بەڵكو ناردوومی تا مامۆستاو كارئاسان كاربم .**

**(٢٥٦) عن معاوية بن الحكم السلميّ قال: بينا أنا أُصلي مع رسول الله ﴿ﷺ﴾ إذا عطس رجل من القوم. فقلت: يرحمك الله، فرماني القوم بأبصارهم، فقلت: وا ثكل أُمِيّاه ، ماشانكم تنظرون اليّ؟، فجعلوا يضربون بأيديهم على أفخاذهم. فلما رأيتهم يصمتونني. لكني سكت. فلما صلى رسول الله ﴿ﷺ﴾ فبأبي هو وأمي. مارايت معلّما قبله ولابعده احسن تعليما منه، فوالله ماكهرني ولاضربني ولاشتمني. قال: (( ان هذه الصلاة لايصلح فيها شيء من كلام الناس، انما هو التسبيح والتكبير وقراءة القرآن ))** مسلم ١ / ٣٨١ رقم ٣٣ / ٥٣٧ .

**واته: معاويەی كوڕی حەكەمی سەلەمی دەفەرموێت: جارێكیان من لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﴿ﷺ﴾ نوێژم دەكرد بەجەماعەت . یەكێك لەو خەڵكەی لە دوایەوە نوێژیان دەكرد پژمی و منیش ووتم (یرحمك الله ) خەڵكەكەش بەچاو تەماشایان دەكردم. منیش ووتم: لەبار دایكم بچم .یان دایكم سنگم بۆ بكوتێ ئەوە چیتانە ئاوەها تەماشام دەكەن!! ئەوانیش دەستیان دەكێشا بەسەر ڕانیاندا . بۆیە كە بینیم ئەیانەوێ بێدەنگم بكەن بێدەنگ بووم . كاتێ پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ لەنوێژ بوویەوە ، باوك دایكم بە فیدای بن هەرگیز نە لەپێش ئەوەوەو نە لەدوای ئەو مامۆستای وەك ئەو چاك فێركارم نەبینیوە، سوێند بەخوا ناڕەحەتی نەكردمو لێی نەدام و قسەو جوێنی پێ نەدامو فەرمووی : ئەم نوێژە ناشێ قسەی خەڵكی تێدا بكرێت، بەڵكو بریتیەلە بەپاكو گەورە ڕاگرتنی خوای گەورە و قورئان خوێندن .**

**وە لە ئەنەسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەفەرموێت: ( جارێكیان ئێمە لەمزگەوت دا بووین لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾،كابرایەكی دەشتەكی هات و دەستی كرد بەمیزكردن لە مزگەوتەكەدا . خەڵكەكە هەستان ولێی هاتنە قسەو هاوارو دەیانووت: (مە، مە) وازبێنە وازبێنە نەكەیت . پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: (( لاتزرموه ، دعوه )) واته: پێی مەبڕن ووازی لێبهێنن . ئەوانیش وازی لێدەهێنن تامیزەكەی تەواو دەكات . پاشان پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ ئەو كابرایە بانگ دەكات و پێی دەفەرموێت: (( إنّ المساجد لا تصلح لشيء من هذا البول القذر، إنما هي لذكرالله، و الصلاة، و قرآءة القرآن)).**

واتە: ئەم مزگەوتانە ناشێ شتی پیسی وەکو میزو پیسایی تێبکرێت بەڵکو دروست کراوە بۆ ذیکری خواو نوێژکردن و قورئان خوێندن. پاشان بە هاوەڵەکانی – تەنانەت ئەگەر خراپەشی لەگەڵ بکردایە زۆر بە نەرمی وەلاَمی دەدایەوە(٢٥٧). وە بەرامبەر نەفامێتی خەڵکیش زۆر بە ئارام و دەرون فراوان بووە(٢٥٨).

---

فەرموو: (( **إنما بعثتم مبشّرين، و لم تبعثوا معسرين، صُبّوا عليه دلواً من الماء**)). واتە: ئێوە نێردراون تا مژدەدەر بن و نەنێردراون كارگرانكەر بن، دۆڵچەیەك ئاو بكەن بەسەر شوێنی میزەكەی‌دا. كابرای دەشتەكی كە ئەمەی بینی ووتی: (( **اللهم ارحمني و محمداً، و لا ترحم معنا أحداً**)). واتە: خوایە ڕەحم بە من و محمد بكەو ڕەحم بەكەسی تر نەكەیت لە گەڵمان!!. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (( **لقد تحجّرت واسعاً**)). واتە: بە راستی شتێكی بەرفراوانت تەسك كردووە [كە ڕەحمی خوای گەورەیە] متفق عليه.

وە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فبما رحمة من الله لنت لهم و لو كنت فظاً غليظ القلب لانفضوا من حولك. ﴾ آل عمران. واتە: بەهۆی رەحمی خوای گەورەوە نەرم بویت بۆیان، خۆ ئەگەر تووڕەو ڕەق و دڵئەستوور بویتایە ئەوا لە چوار دەورت بڵاوەیان لێ دەكردو دەڕۆیشتن..

(٢٥٧) لە عائیشەوە دەفەرموێ: جولەكەكان دەهاتن بۆلای پێغەمبەری خوا ﷺ دەیانووت: (**السام عليك**)، واتە: مردنت لەسەر بێت!! ئەویش دەیفەرموو: (( **و عليكم**)) واتە: لەسەر ئێوە بێت. عائیشەش فەرموی: ( **السام عليكم، ولعنكم الله وغضب عليكم**). واتە: مردنتان لێ‌بێت و نەفرین و غەزەبی خوایتان لەسەر. پێغەمبەری‌خوا ﷺ فەرموی: **((مهلاً ياعائشة: عليك بالرفق، و إياك والعُنف والفُحش))**.واتە: ئەی عائیشە هێواش بە نەرم بەو نەكەیت ڕەق وتوندو دەم شڕبیت. عائیشە فەرمووی: ئەی نەت بیست وتیان چی ؟ فەرموی ((**أولم تسمعي ما قلت: رددتُ عليهم، فيستجاب لي ولا يستجاب لهم فيَّ**)) واتە: ئەی تۆ نەتبیست من ووتم چی؟ ڕەتی قسەكەیانم دایەوەو نزاكەی من گیرا دەبێت و ئەوەی ئەوان لە سەر من گیرا نابێ./ رواه البخاري . وفي رواية لمسلم ((**لا تكوني فاحشة ، فإن الله لايحب الفُحشَ والتفحش** )). واتە: دەم شڕ مەبە خوای گەورە دەم پیس و خۆ دەم پیس كارێتی‌و رەوشت ناشیرینی خۆش ناوێ.

(٢٥٨)**عن انس بن مالك ( رضي الله عنه) قال :(كنت أمشي مع النبي ﷺ وعليه بُردٌ نجراني غليظ الحاشية فادركه أعرابى فجبَذه بردائه جبذة شد يدة . حتى نظرتُ إلى صفحة عاتق رسول الله ﷺ قد أثرتْ بها حاشية البُرد من شدة جبذته، قال : يامحمد ، مُر لي من مال الله الذى عندك ، فالتفت رسول الله ﷺ ثم ضحك ثم أمر له بعطاء )** متفق عليه

واتە: ئەنەس دەفەرموێ: من جارێكیان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ دەڕۆیشتم بەڕێدا، ئەویش كراسێكی نەجرانی لێوار ئەستوری لە بەردابوو، كابرایەكی دەشتەكی پێ‌گەیشت و زۆر بە توندی كراسەكەی ڕاتەكاند ، بە جۆرێ تەماشای لاملی پێغەمبەری خوام كرد ﷺ شوێنەوارو جێگای كراسەكەی تێدا دەرچوو بوو ئەوەندە توند

ڕایکێشا. وتی: ئەی محمد لەو ماڵەی خوا داوێتی پێت شتێکم بدەرێ،پێغەمبەری خواش ﴿ﷺ﴾ ئاوڕی لێ دایەوەو پێکەنی ، پاشان فەرمانی کرد کە پێی ببەخشن .

**وە هەرگیز لە کاتی پێکەنینیدا مەلاشووی دەرنەکەوتوەو قاقای نەکردووە[٢٥٩] ناوی ناشیرین و ناشیاوی خەڵکی دەگۆڕی[٢٦٠]**

---

وە لە عبدالله ی کوری مەسعودەوە دەفەرموێ : پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ شتێکی بەش دەکرد٠کابرایەك ووتی :(**ماأريد بهذا وجه الله !!**) واتە: لەم دابەش کردنەیدا مەبەستی خوا نەبوو !! ابن مسعودیش قسەکە دەگێڕێتەوە بۆ پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ وە ئەویش تورە دەبێت و ڕەنگی دەم وچاوی تێك دەچێت و دەفەرمووێت: (( **رحم الله موسى، قد أوذي بما هو أشد من هذا فصبر** )). متفق عليه

واتە: ڕەحمەتی خوا لەموسا بێت لەمە زیاتر ئەزێت درا بەلأم ئارامی گرت.

وەعائیشە(ڕەزای خوای لێ بێت) پرسیاری لێکرد. ئایا هیچ ڕۆژێکت بەسەردا هاتووە لە ڕۆژی ئوحد ناڕەحەت تر بووبێ ؟ فەرمووی: ((من لە بەرامبەر گەلەکەی تۆوە زۆرم توش هات و لە نارەحەت ترینیان ڕۆژی عەقەبە بوو کاتێ بانگەوازی (ابن عبد یالیل بن عبد کلال )م کرد و وەلأمی داوا کاریەکەمی نەدایەوە منیش بەخەفەتەوە ڕۆیشتم تا گەشتمە (قرن الثعالب) [ کە شاخێکە لە نێوان طائیف و مەککەدا ] سەرم بەرزکردەوە دەبینم هەورێك سێبەری بۆ کردووم تەماشام کرد جبریل ی تیا بوو فەرمووی: خوای گەورە ووتەی گەلەکەتی بیست کە چییان پێ ووتی و ڕەدیان چی بوو بۆت و مەلائیکەتی شاخی ناردووە بۆلات تا بزانن فەرمانت بەچیە، پاشان مەلائیکەتی شاخەکان سلأوی کردو فەرموی: ئەی محمد خوای گەورە ووتەی گەلەکەتی بیست منیش مەلائیکەتی لێپرسراوی شاخەکانم و خوای پەروەردگارت ناردوومی بۆلات تا بزانم فەرمانت چیە بە من، ئەگەر ئەتەوێت ئەو دووشاخەی (الأخشبين)ی مەککەیان لێدەدەم بەیەکدا. پێغەمبەری‌خوا﴿ﷺ﴾ فەرموی: (**(بل أرجو أن يُخرج الله من أصلابهم مَن يعبد الله وحده لايشرك به شيئاَ ))** متفق عليه ٠

واتە: بەڵکو من ئومێد دەکەم کە خوای گەورە لە نەوەوپشتی ئەمانەوە کەسانێك بخاتەوە کە بە تەنها خوای‌گەورە بپەرستن و هیچ هاوەڵێکی بۆ پەیدا نەکەن.

(٢٥٩) **عن عائشة قالت: (مارأيتْ رسول الله ﴿ﷺ﴾ مستجمعاَ قط ضاحكاً حتى أرى منه لهواته، إنما ضحكه التبسم )** رواه البخاري .

واتە: هەرگیز پێغەمبەری خوام ﴿ﷺ﴾ نەبینیوە پڕ بە دەمی پێکەنیبێت و ئەوپەڕی قوڕگ و مەلأشوی دەرکەوتبێ. بەڵکو پێکەنینەکەی تەنها زەردەخەنە کردن بوو.

(٢٦٠) **(كان يغيّر الاسم القبيح ).** صحيح رواه الترمذي .

واتە: پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ ناوی خراپ و ناشیرینی دەگۆڕی .

**لە کاتی ڕۆیشتندا هاوەڵەکان لەبەردەمی‌یەوە دەڕۆیشتن و پشتەوەیان جێ دەهێشت بۆ مەلائیکەت(٢٦١) . هەرگیز تەوقەی لەگەڵ ئافرەتاندا نەدەکرد(٢٦٢) کـە دەچـوو بۆسـەردانی کەسـێك ڕووەو دەرگاکـە نەدەوەسـتا بـەڵکو لەلایەکی‌یـەوە ڕادەوەستا(٢٦٣) وەدەستی ڕاستی زۆر بەکاردەهێنا(٢٦٤) کاتێ هەواڵێکی خۆشیان بۆ بهێنایە سەجدەی شوکری دەبرد بۆ خوای گەورە(٢٦٥)**

---

(٢٦١)**(كان اذا مشى مشى أصحابه أمامه، وتركوا ظهره للملائكة)**صحيح رواه ابن ماجه.

**واتە:کاتێ پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ بڕۆشتایە بەڕێدا هاوەڵەکانی لە پشتی‌یەوە دەڕۆیشتن و دوایەوەیان جێدەهێشت بۆمەلائیکەت.**

(٢٦٢) **(كان لا يصافح النساء في البيعة)** حسن رواه احمد.

**واتـە: هـەرگیز تەوقـەی لەگـەڵ ئافرەتانـدا نـەدەکرد نەلەکاتی‌بەیعـەت و [نـە لەغـەیری بەیعەتیش دا ].**

**وقالت عائشة: (ولا والله مامَسَّت يده ﴿ﷺ﴾ يد امرأة قط في المبايعة. ما بايعهن إلا بقوله: قد بايعتك على ذلك )** صحيح رواه البخاري

(٢٦٣ ) **(كان إذا أتى باب قوم لم يستقبل الباب من تلقاء وجهه، ولكن من ركنه الأيمن أو الأيسر، ويقول: السلام عليكم، السلام عليكم ))** صحيح رواه احمد .

**واتـە: ئەگـەر بچـوایەتە بـەردەمی هـەر ماڵێك ڕووەو دەرگاکـە نەدەوەسـتا بـەڵکو لـەلای ڕاست یان چەپەوە دەوەستا و دەیفەرموو: سڵاوتان لێ بێ، سڵاوتان لێ بێ .**

(٢٦٤) **(كان يجعل يمينه لأكله وشربه و وضوئه و ثيابه و أخذه وعطائه ،وشماله لما سوى ذلك)** صحيح رواه أحمد.

**واتـە: لای ڕاسـتی بـەکاردەهێنا لـە بـۆ خـواردن و خواردنـەوەو دەسـت نوێـژو پۆشـاك لەبەرکردن و وەرگرتن و بەخشین ولای چەپی بۆ شتەکانی تر.**

(٢٦٥) **(كان إذا جاءه أمر يُسَرُّ به ، خَرّ ساجداً ◦ شكراً لله تعالى)** صحيح رواه ابو داود .

**واتە: کاتێ هەواڵێکی خۆشیان بۆ بهێنایە سەجدەی دەبـرد لـە شـوکرانە بـژێری خـوای گەورەدا.**

وه له كاتى پژمين دا بەدەستى يان كراسەكەى دەم و چاوى دادەپۆشىو دەنگى پىٚ نـزم دەكـردەوه[٢٦٦] وه حـەزى لـەپاك و خـاوێنىو پۆشـاكى جوان بووه[٢٦٧] پێغەمبەرى خوا ﴿ﷺ﴾ زۆر بەبەزەيى بووه، به تايبەت لەگەڵ

---

(٣٦٦) **( وكان ﴿ﷺ﴾ إذا عطس غطّى وجهه بيده أو ثوبه، وغَضَّ بها صوته)** رواه الترمذى وقال : حديث حسن صحيح .

**واتـه: كـاتىٚ دەپـژمى بەدەسـتى يـان پۆشـاكەكەى دەم و چـاوى دادەپۆشـىو دەنگـى خۆى پىٚنـزم دەكردەوه .**

**(٢٦٧) لـه جـابرەوه ( ڕەزاى خـواى گـەورەى لىٚ بێـت) دەفـەرمودىٚ: لەگـەڵ پێغەمبـەرى خوادا﴿ﷺ﴾ دەرچووين بۆ غەزاى (بني انمار)، دەفەرمودىٚ: لەكاتێكدا من لـه ژێـر دارێكدا بووم ئەوەندەم زانى پێغەمبەرى خوام ﴿ﷺ﴾ بينـى، منـيش ووتم: ئـەى پێغەمبـەرى خـوا جـەنابت تەشـريف بێنـه ژێـر ئـەم سێبەرەو. ئـەويش هـات و سـلاٚوى كـرد و لەولاٚغەكـەى دابەزى. منيش چووم هەندىٚ ترۆزى ناسك و ووردم هێناو خستمه بەردەستى. ئەويش فەرمووى: ئەمەتان لەكوىٚ بوو؟ ووتم: له مەدينەوه لەگەڵ خۆمان هێنامان.**

**لـەو كاتـەدا شـوانێكى جـابر دەرچـوو دوو پۆشـاكى كـۆنى لەبـەردا بـوو ڕزيبـون. پێغەمبەرى خوا ﴿ﷺ﴾ تەماشاى كردو فـەرمووى: ((أما له ثوبـان غيرهـذين)).واتـه: ئايا پۆشـاكى تـرى جگـه لەمـەى نىيـه. منـيش وتم : بـەڵىٚ دوو پۆشـاكى تـرى هەيـه هـەڵى گرتووه من خۆم پێم داوه . ئەويش فەرموى : ((فادعه فليلبسها)) واتـه: بـانگى بكـه وپىٚـى بڵـىٚ با لەبـەريان بكـات. شـوانەكه هـات و دوو پۆشـاكەكەى تـرى لەبـەركردو و ڕۆيشـت. پێغەمبەرى خوا﴿ﷺ﴾فەرموى: (( ماله ؟ ضرب الله عنقه أليس هذا خيراً ؟))**

**واتە: چيەتى – خوا با لەگەردنى – ئايا ئەمـه باشـتر نىيـه ؟ شـوانەكەش گـوىٚـى لـه قسـەكەى بـوو بەگـەش بينـاوى يـەوه فـەرمووى :ئـەى پێغەمبـەرى خـوا ئايـا لەپێناوى خـوادا [خـوا بـدات لـه گـەردنم] ؟ فـەرموى: (في سـبيل الله )واتـه: بـەڵىٚ لـه**

پێناوی خوای گەورەدا. ئەوەبوو ئەو پیاوە لەپێناوی خوادا دەکوژرێ / رواه الامام مالك والحاكم وقال محقق جامع الاصول: اسناده حسن ٠

## کەس و کار نەوەکانیدا[٢٦٨] بە جۆرێ ماچی کچەزاکانی خۆی دەکرد[٢٦٩]

---

(٢٦٨)**خوای گەورە دەفەرموێ:** ﴿ وماأرسلناك إلا رحمة للعالمين﴾ سورة الانبياء.

**وە خۆشی﴿ﷺ﴾ دەفەرموێت:(( إنما أنا رحمة مُهداة**) رواه الحا كم وصححه ووافقه الذهبى .

**واتە: من ڕەحمەتێکی ڕێنمونی کارم.**

**وە ئەنەسی کوڕی مالك دەفەرموێ :( مارأيت أحداً كان أرحم بالعيال من رسول الله ﴿ﷺ﴾ )** رواه مسلم ٠

**واتە: کەسێکم نەدیوە لەپێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾زیاتر بەبەزەیی بووبێت لەگەڵ خێزان وکەس و کاری دا.**

**(٢٦٩ ) لە أبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ماچی حەسەنی کوڕی عەلی کرد لەوکاتەدا ئەقرەعی کوڕی حابسی تەمیمی لە گەڵدا بوو، ئەقرەع ووتی: من(دە) منداڵم هەیە [تا ئێستا] هیچیانم ماچ نەکردوە، پێغەمبەری خواش ﴿ﷺ﴾ تەماشای کردو پاشان فەرموی: ((من لايرحم لا يُرحم))** متفق عليه.

**واتە: هەرکەسێك ڕەحم بەخەڵکی نەکات خوای گەورەش ڕەحمی پێ ناکات.**

وەعائیشە دەفەرموێ :(**جاء أعرابى إلى رسول الله ﴿ﷺ﴾ فقال : إنكم تُقبِّلون الصبيان، ولا نُقبِّلهم. فقال رسول الله ﴿ﷺ﴾: ((أو أملكُ لك أن نزع الله الرحمة من قلبك ))** متفق عليه.

**واتە: کابرایەکی دەشتەکی هات بۆخزمەتی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ ووتی: ئێوە منداڵەکانتان ماچ دەکەن بەڵام ئێمە هەرگیز ماچیان ناکەین، جپێغەمبەری خواش**

**(ﷺ) فەرمووی: من چی دەسەڵاتێکم هەیە کە خوای گەورە بەزەیی لەدڵتا دەرهێناوە.**

**نەك هەر لەگەڵ مرۆڤدا بەڵکو زۆر بەبەزەیی بووە لەگەڵ گیانلەبەرانیشدا(٢٧٠) بە جۆرێك جامی ئاوی لار دەکردەوە بۆ پشیلە تالیبخواتەوەو بە پاشماوەکەشی دەست نوێژی دەشت(٢٧١).**

---

(٢٧٠)**عن سهيل بن الحنظلية قال: (( مَرّ رسول الله (ﷺ) ببعير قد لحق ظهره ببطنه فقال: (( اتقوا الله في هذه البهائم المعجمة فاركبوها صالحة ، وكلوها صالحة)).** اخرجه ابوداود وحسن اسناده الارناؤوط .

**واتە: پێغەمبەری خوا(ﷺ) دای بەلای حوشترێکدا کە لە لاوازیدا سکی لچکابوو بە پشتییەوە فەرموی: لە خوا بترسن لەم ئاژەڵە بێ زمانانەداو بەچاکی سواری بن و بە چاکی بیخۆن.**

**وە لە ابن عەباسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت ) دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) دای بەلای کابرایەکدا قاچی خستبووە سەر لاملی مەڕێك و خەریکی تیژ کردنی چەقۆکەی بوو مەڕەکەش لەژێر پێیدا تەماشای دەکرد، پێغەمبەریخوا(ﷺ) فەرموی :((أ تريد أن تميتها موتتين ؟! هلاّ حددت شفرتك قبل أن تضجعها))** . رواه الحاكم وقال : صحيح على شرط الشيخين و وافقه الذهبي **.واتە: ئایا ئەتەوێ دووجار بیکوژی؟ ئایا نەدەبوو پێش ئەوەی بیدەی بە زەویدا چەقۆکەت تیژ بکردایە.**

**وە لە عبدالله وە لەباوکییەوە دەفەرموێ: ئێمە لە سەفەرێکدا لە خزمەت پێغەمبەری خوادا بووین (ﷺ)، ڕۆی بۆ کارێکی خۆی، ئێمەش ( حوممەرە) یەکمان بینی [ باڵندەیەکە لە چۆلەکە دەچێت ] دوو بەچکەی لە گەڵدا بووئێمەش دوو بێچوەکەیمان برد. حوممەرەکە هات و دەستیکرد بەجریواندن و لەشەقەی باڵدان و خۆسەغڵەت کردن.**

**کاتێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاتەوە فەرموی:(من فجع هذه بولدها؟ رُدواّ ولدها اليها ) واتە: کێ بەچکەکەی لێ بردووە، بۆی بگەڕێننەوە. وە شارە مێروولەیەکی بینی ئێمە سو تاندبوومان فەرمووی: (( من أحرق هذه ؟ )) واتە: کێ ئەمەی سوتاند؟ وتمان: ئێمە، فەرموی: (( لا ينبغى أن يُعذّب بالنار الا رب النار )).** رواه أحمد وغيره وصحح اسناده الارناؤوط.

واته: بۆ هیچ کەسێك نی‌یە سزای کەس بدات بە ئاگر جگە لە پەروەردگاری ئاگر.

(٢٧١) ( **كان ﴿ﷺ﴾ يُصغي للهرة الإناء ، فتشرب ثم يتوضأ بفضلها**). صحيح رواه الطبراني .

واتـــە: پێغەمبـــەری خـــوا﴿ﷺ﴾ جـامی لاردەکـردەوە بـۆ پشـیلەو ئـەویش لێـی دەخواردەوە، دوایی پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ بە پاش ماوەکەی دەست نوێژی دەشت.

**وە پێغەمبـەری خۆشەویست ﴿ﷺ﴾ دادپـەروەر بـووە لـە کاروبارەکانی‌داو خـوای گـەورە بەمـە فـەرمانی پـێ کـردووە[٢٧٢] وە زۆر دڵ سـەخاوەت و بەخشندە بووەو هەرگیز بەخیل نەبووە[٢٧٣] .**

---

(٢٧٢) خوای گەورە دەفەرموێ :﴿ وأمِرتُ لأعدِلَ بينكم ﴾ الشورى/١٥

واتە: ئەی پێغەمبەری خوابڵێ.....وە فەرمانم پێ‌کراوە لە نێوانتاندا دادپەروەربم.

لەعائیشـەوە دەفـەرموێ: قـورەیش مەسـەلەی ئـەو ئافرەتـە مەخزومیـەی زۆر بـە گـرنگ تەماشا دەکرد کە دزی کردبوو وە سەرقاڵی کردبوون ؟ وتیان: کێ هەیە ئەتوانێت بچێت قسە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا﴿ﷺ﴾ بکات تادەستی ئەو ئافرەتە نەبڕێت؟ وتیان: جاجگـە لـە ئوسامەی کوڕی زەیـد کـێ هەیـە جورئـەتی ئـەوە بکـات کەخۆشەویستی پێغەمبـەری خوایـە﴿ﷺ﴾، ئوسـامەش چـوو قسـەی لەگـەڵ کـرد[ بـۆ ئـەوەی حوکمەکـەی لەسـەر نەچەسپێت] پێغەمبەری خواش ﴿ﷺ﴾ فـەرموی: ((**أ تشفعُ في حَدٍّ من حدود الله ؟**)) ئایا تکا دەکەیت لەحەددێك لەحەدەکانی خوادا؟ پاشان هەستاو ووتاری‌دا ئینجا فەرموی :

(( **إنما هلك الذين قبلكم: أنهم كانوا اذا سرق فيهم الشريف تركوه، و إذا سرق فيهم الضـعيف أقاموا عليه الحد، وأيم الله لو أن فاطمة بنت محمد سرقت لقطعتُ يدها** )) .

واتە: ئومەتانی پێش ئێوە بە هۆی ئەوەوە لـە ناوچوون ئەگـەر لـە ناویانـدا کەسێکی نـاودارو بـە دەسـتەڵات دزی بکردایـە وازیـان لێ دەهێنـاو ئەگـەر کەسـێکی لاواز و بێ‌دەستەڵات دزی بکردایـە حـەددیان لـە سـەر دەچەسپان، سا سوێند بـە خـوای گـەورە ئەگـەر فاطمـەی کچـی محمـد دزی بکـات دەسـتی دەبـڕم. پاشـان فـەرمان درا بەسـەر ئـەو ئافرەتەدا کە دزی‌یەکەی کردبوو دەستی بڕدرا.

عائیشە دەفەرموێ: دوای ئەوە ئەو ئافرەتە بەچاکی تەوبەی کردو پاش ئەوە دەهات و منیش پێویستی‌یەکانیم بەرز دەکردەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾. متفق عليه.

(٢٧٣) **عن أنس: (أن رجلاً سأل النبي ﴿ﷺ﴾ فأعطاه غنماً بين جبلين، فأتى قومه فقال: أي قوم أسلموا، فأن محمداً يعطي عطاء مايخاف الفاقة، فإن كان الرجل ليجيء الى رسول الله مايريد إلا الدنيا، فما يمسي حتى يكون دينه أحبَّ اليه وأعزَّ عليه من الدنيا وما فيها )** رواه مسلم

واته: پیاوێك هات و داوای لە پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ كرد ئەویش كۆمەڵە ڕانە مەڕێكی پێدا كە لە نێوان دوو شاخ دا بوو، ئەویش گەڕاوە بۆ لای گەلەكەیو ووتی: ئەی گەلینە موسڵمان بن، بە ڕاستی محمد بەخشینێك دە بەخشێ لە هەژاری ناترسێ، جاپیاوی وا هەبوو دەهات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ مەبەستی تەنها دونیا بوو، ئەوەندەی نەدەبرد هەتا وای لێ دەهات دینەكەی بەلاوە خۆشەویستترو بە بەهاو سەنگین تر بوو لە دونیا و چی تێدایە.

وله ابن شەهابەوە دەفەرموێ: (**پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾** غەزای فەتحی كرد (فەتحیمەككە) **پاشان بەخۆیو موسڵمانانەوە دەرچون و لە حونەیندا بەجەنگ هاتن وخوای گەورە دینەكەیو موسڵمانانی سەرخست، ئەو ڕۆژەش پێغەمبەریخوا﴿ﷺ﴾ سەد حوشتریبەخشی بە صەفوانی كوڕی ئومەیە، پاشان سەدی تری دایە، پاشان سەدی تری دایە. ابن شهاب دەفەرموێت: سعیدی كوڕی موسەییەب بۆی باس كردم كەوا صەفوان فەرمویەتی: سوێند بەخوا پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ ئەوەندەی دامێ كە دایمێ. وە ئەو ڕق لێ بووەوەترین كەس بوو لە لای من، بەلأم ئەوەندەی پێبەخشیم تا وای لێ هات ئێستا خۆشەویسترین كەسە لە لای من).**رواه مسلم .

وە كاتێ پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ لە غەزای حونەین گەڕایەوە ئەعرابەكان شوێنی كەوتن و داوایان لێ دەكرد تا پێیان ببەخشێ تا گەیاندیانە لای دارێك و عەباكەی كەوتە خوارەوە لە كاتێكدا بەسەر حوشترەكەیەوە بوو فەرموی: (**(رُدّوا عليّ ردائى، أتخشون عليَّ البخل ؟ فوالله لوكان لي عدد هذه العضاةِ نِعماً لقسمتُه بينكم، ثم لا تجدوني بخيلاً ولا جباناً ولا كذاباً ))** رواه البخاری .

واته: پۆشاكەكەم بۆ بگێڕنەوە، ئایا ئەترسن لێم كە بەخیل بم؟ سوێند بە خوا ئەگەر بە ئەندازەی ئەم زیخ وچەوانە ووشترم لە بەردەستابێت بەشم دەكرد بەسەرتانداو پاشان نەبەخیل و نەترسنۆك و نەدرۆزن نە دەبووم .

**(بايع الرسول ﴿ﷺ﴾ جابر بن عبدالله في جَمل له كان قد كَلَّ في السفر ، فباعه إياه بكذا درهماً ، ولما جاء يتقاضاه الثمن أعطاه الثمن والجمل معاً )** متفق عليه.

واتـه: لـه سـەفەرێكدا پێغەمبـەریخوا(ﷺ) حوشترێكی لـه جابری كوڕی عبداللـه كڕی تا سواری ببێت، ئەویش پێی فرۆشت بـه ئەوەنده درهـەم (بـه قـەرز)، جا كاتێ جـابر هـات تـا نرخەكـەی لوەرگرێـت، پێغەمبــەری خــوا(ﷺ) نرخەكەشــی دایــەو حوشترەكەشی بۆ گەڕاندەوە.

خوای گەورە زۆرێك لە موعجیزاتی پێبەخشیبوو[٢٧٤] .

---

(٢٧٤) گەورەترین موعجیزەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) كە خوای گەورە پێی بەخشیوە قورئانـه، هـەروەها زۆر مـوعجیزەی تـری هـەبووە وەكـو: لـەت بـوونی مـانگ و شـەوڕەوی‌و بڵندبونەوەی ( **الإسرآء والمعراج** )و بینینی هەموو ئەو شتانه لەو كاته كەمەدا، وە بەرەكەت كەوتنه خواردنەوە بە ویستی خوای گەورە وەكو لـه خەندەق دا (١٤٠٠ ) هاوەڵ لـه یەك چێتریان خوارد ، وە(١٣٠) كەس لەیەك جگەریان خوارد لـه شوێنێكی تردا، وە خواردن لـه بـەردەمیا تەسـبیحاتی دەكـردو هـاوەڵان دەیـان بیسـت، و لـه تەبوكـدا ئـاو لـه نێـوان پەنجەكانیەوە دەهاته دەر كاتێ دەستی خسته نـاو جامـه ئاوەكـەوە بـەجۆرێ (٣٠) هـەزار كـەس لەگـه لێ (١٠) هـەزار وشـتر لێیـان خـواردەوە و شـتیان لێ پڕكـرد. وە لـه حودەیبیـەدا تیرێكی خسته ناو بیرێكی وشك بوو ( بسم الله)ی كرد ئاوەكه پڕبوو تا( ١٤٠٠) صەحابه لێیـان خـواردەوە بـۆ مـاوەی (١٥) ڕۆژ و هەرمایـەوە، وە بـەردێك هـەبوو سلاوی لێدەكرد لەكاتی پێغەمبەرایەتیدا، گیان لەبەرانیش شكاتی حاڵیـان دەهێنایـه لای و دارو درەخـت بـه تاسـەوە بـوون بۆی‌و سـێبەرو پـەردەیان بـۆ دەكـرد، وە قـەدە دارخورمایـەك هـەبوو لەلای‌دا وتاری دەدا، دوای ئەوەی چووە سەر مینبـەر ئەو بنـه داره وەك منداڵ دەگریـا تـا باوەشـی پیـا كـردو ئینجـا بـێ دەنـگ بـوو. وە تورەكـه خورمایەكی‌دا بـه أبـو هـورەیرەو فەرمووی: مەیكەرەوە و دەستی پیا بكەو لێی بخۆ، ئەوەبوو تا سەردەمی دوای كوژرانی عثمان (ڕەزای خوای گەورەی لێ بێت) تیایدا مابوو بێ خراپ بوون هەتا توورەكەكـه پـووا بوو هەڵتەقی. وە چەندان موعجیزەی تر كه لێرەدا جێگەی نابێتەوە، بۆ زیاتر شارەزابون بگـەرێرەوە بـۆ كتێبی(مـوعجیزاتی ئەحمـەدی) دانـراوی: مامۆسـتا سـەعیدی نۆرسـی‌و كتێبەكانی (سیرة) .

ئەم پێغەمبەرە خۆشەویستە ﴿ﷺ﴾ خوای گەورە بەهۆیەوە چاوانی کوێرو گوێیانی کەڕو دڵانی داخراوی پێکردەوە(٢٧٥) وە نێردرابوو تا ڕەوشتە جوانەکان بچەسپێنیت و تەواوی بکات(٢٧٦) لە گەڵ ئەوەی کە ئازاری کەسی نەداوە کەچی دوعای دەکرد کە قسەی بە هەرکەسێك ووتووە خوای گەورە بۆ ئەو کەسە بکاتە پاداشت و نزیك بوونەوە لە خۆی(٢٧٧) .

---

(٢٧٥) لە عەطائی کوڕی یەسارەوە دەفەموێت: گەیشتم بە عبداللەی کوڕی عمروی کوڕی عاص (ڕەزای خوای لێ بێت) ووتم : هەواڵم بدەرێ دەربارەی سیفەتی پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ لە تەوراتا چۆن هاتووە، ئەویش فەرمووی: (بەڵێ سوێند بەخوا ئەو وەسف کراوە لەتەوراتدا بە هەندێ لەو وەسفانەی کە لە قورئاندا ها تووە:﴿ يا أيها النبي إنا أرسلناك شاهداً ومبشراً ونذيراً ﴾ **وحرزاً للأميين، أنت عبدي ورسولي سميتك المتوكل، ليس بفظ ولا غليظ، ولاسخاب في الاسواق، ولا يدفع السيئة بالسيئة، ولكن يعفو ويصفح، ولن يقبضه الله حتى يقيم به الملة العوجاء، بأن يقولوا: ((لااله الا الله،ويفتح به أعينا عُمياً، وأذاناَ صماً، وقلوباً غُلفاَ))** رواه البخاري واحمد . تفسير ابن كثير ٣/٤٣٤ .

واتە: (ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە تۆمان ڕەوانە کردووە بەشاهێدیو مژدەدەریو ئاگادار کەرەوەیی)، وە بەوەی ببێتە پارێزەری نەخوێندەواران، تۆ بەندەو نێردراوی منی ، ناوم ناوی (المتوکل) پشت بەخوا بەستوو. هەرگیز ڕووگرژ و زبرو ڕەق نییەو لە بازاڕدا دەنگ بەرز ناکاتەوەو خراپە بەخراپەش ناداتەوە بەڵکو دەبوورێو دەبەخشێ. وە خوای گەورە گیانی ناکێشێت هەتا میللەتی لاری پێ ڕاست دەکاتەوە بەوەی بڵێن: (لا الە الا اللە)، وەخوای گەورە بەهۆی ئەمەوە چاوانی کوێرو گوێ یانی کەڕو دڵانی داخراو دەکاتەوە.

(٢٧٦) پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ دەفەرموێت: **((انما بُعثت لأُتمّم مكارم (وفي رواية:صالح) الأخلاق)).** صحيح بشواهده. اخرجه البخاري في (الادب المفرد) ص٤٢ وأحمد ٢/٣٨١ والحاكم ٢/٦١٣.

واتە: من نێردراوم تا ڕەوشتە بەرزو چاکەکان تەواو بکەم.

(٢٧٧) لە ئەبوهورەیرەوە (رەزای خوای لیْ بیْت) کەوا بیستویەتی لە پیْغەمبەری خواوە ﴿ﷺ﴾ کەفەرمویەتی: **((اللهم فأيما مؤمن سببتُه فاجعل ذلك له قربةً إليك يوم القيامة))**. البخاري مع الفتح ١١/١٧١ ومسلم ولفظه (( **... فاجعلها له زكاةً ورحمة**)).

واتە: خوایە هەرکەسیْك قسەم پیْ ووتووەو ئەزیْتم داوە ئەوا بۆی بکەرە پاك بوونەوەو رەحمەت و نزیك بوونەوەیەك لەخۆت لە رۆژی دواییدا.

**بە کورتی رەوشتی قورئانی بووە[٢٧٨] ئەمەندە ئازا بووە لە کاتی غەزاکاندا لەپیْشی هاوەڵەکانەوە دەجەنگا [٢٧٩] . وە راستەوخۆ لە کارە سەختەکاندا لەگەڵ هاوەڵەکانیدا بووە، زۆر رۆح سووك بووە بە جۆریْك هەرگیز باویْشکی نەداوە [٢٨٠] .**

---

(٢٧٨) کاتیْك پرسیاریان کرد لەعائیشە (رەزای خوای لیْبیْت)دەربارەی رەوشتی پیْغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ ئەویش فەرموی:(**كان خلقه القرأن**) اخرجه مسلم (٦/٢٥ – نووي).

واتە: رەوشتی پیْغەمبەر﴿ﷺ﴾ قورئانی بووە [واتە تەرجومەیەکی کرداری بووە بۆ قورئان].

(٢٧٩) بەراء دەفەرمویْت: **(كنا والله إذا احمرّ البأس نتقي به وإن الشجاع منا الذي يُحاذي به)** رواه البخاري ومسلم.

واتە: سویْند بەخوا کاتیْ کە جەنگ گەرم دەبوو ئیْمە خۆمان دەدایە پاڵ پیْغەمبەر﴿ﷺ﴾، وە ئازاترین کەس لە ئیْمە ئەو کەسە بوو کە بە تەنیشتیەوە دەجەنگا.

وە لەعەلیەوە (رەزای خوای لیْبیْت) دەفەرمویْ:(**لقد رأيتني يوم بدر، ونحن نلوذ بالنبي عليه السلام، وهو أقربنا إلى العدو، وكان من أشدّ الناس يومئذً بأساً**).حسن سنده محقق شرح السنة.

واتە: لە رۆژی بەدردا ئیْمە خۆمان دەدایە پاڵ پیْغەمبەر﴿ﷺ﴾ وە ئەو نزیکترین کەس بوو لە دوژمنەوە. ئەو رۆژە ئەو لە هەموو کەس زیاتر سەخت تر بوو لەسەریان.

(٢٨٠) جابر (رەزای خوای لیْبیْت) دەفەرمویْ: ئیْمە [رۆژی خەندەق] چاڵمان هەڵدەکەند، بەردیْکی گەورە هاتە ریْمان و هاتینە خزمەت پیْغەمبەر﴿ﷺ﴾و عەرزیان کرد: بەردیْکی گەورە هاتۆتە ریْمان. ئەویش فەرموی: ((**أنا نازل**)) من دادەبەزم بۆی، ئەوە بوو دابەزی بۆی لەکاتیْکدا لەبرساندا، بەردیْکی بەستبوو بەسکیەوە، وە پیکەکەی هەڵگرت و پیاکیْشانیْك

لێی‌دا کردی بە تەپوتۆزو خۆڵی وردو نەرم). أصل القصة في البخاري و مسلم . (نەك وەك سەرکردەکانی ئەمڕۆ کە تەنها بەردی بناغەکە دادەنێن و ئیتر تەواو......!!)

**عن يزيد بن الأصم قال: ( ما تثاءَبَ النبيُّ ﴿ﷺ﴾ قطٌّ)** رواه البخاري في فتح الباري ص(٦١٣).

**واتە: هەرگیز پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ باوێشکی نەداوە. [چونکە باوێشك نیشانەی تەمبەڵی‌و لەش قورسی‌یەو لە شەیطانەوەیە ] .**

**وە داوای هەرچی‌یەکی لێ بکرایە نەیدەوت نی‌یەو نەخێر [٢٨١] زۆر سەخی دەروون بووە. بە تایبەتی لە مانگی ڕەمەزان دا [٢٨٢] وە بۆ خۆی هیچی هەڵنەدەگرت بۆ سبەینێ [٢٨٣] بەڵام خواردنی ساڵێکی پاشکەوت دەکرد بۆ کەس‌و کارەکەی [٢٨٤] وەدیاری وەردەگرت و پاداشتی دەدایەوە لەسەری [٢٨٥]**

---

(٢٨١) **جابر بن عبدالله يقول:(ما سئل رسول الله ﴿ﷺ﴾ شيئاً قط فقال: لا)**.اخرجه البخاري ومسلم والدارمي والبغوي (٣٦٨٦) وصححه ابن سعد وابو الشيخ والترمذي.

**واتە:هەرگیز پێغەمبەری خوا﴿ ﷺ﴾ داوای هیچ شتێکی لێ نەکراوە لەشتی دنیایی‌و فەرمووبێتی: نەخێر نی‌یەو ناتدەمێ .[بەڵکو یان پێی بەخشیوە گەر هەبوبێ یان وتەیەکی جوانی بۆ ئەکرد یان دەپاڕایەوە بۆی].**

(٢٨٢) **عن ابن عباس(τ): (كان رسول الله ﴿ ﷺ﴾ أجودَ الناس بالخير، وكان أجود ما يكون في شهر رمضان حتى ينسلخ، فيأتيه جبريل فيعرض عليه القرآن، فإذا لقيَهُ جبريل كان رسول الله ﴿ ﷺ﴾ أجود بالخير من الريح المرسلة).** أخرجه البخاري ومسلم والنسائي واحمد ٢٣١/١ و٢٨٨ وابن سعد و أبو الشيخ و البغوي.

**واتە: پێغەمبەری خوا﴿ ﷺ﴾ لەهەموو کەس سەخاوەتمەندتر بوو. لە هەموو کاتیش زیاتر لە مانگی رەمەزاندا زۆر سەخی بوو تا تەواو ئەبوو، وەجیبریل ئەهات بۆلای‌و قورئانی بۆ دەخوێندەوەو کاتێك جیبریل پێی دەگەیشت ئیتر پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ ئەوەندە لەخێرکردندا سەخی بوو زیاتر لە شنە بایەکی هەڵکردوو.**

(٢٨٣) **عن أنس بن مالك (رضي الله تعالى عنه) قال:( كان النبي ﴿ ﷺ﴾ لا يدخر شيئاً للغد).**

اخرجه الترمذي (٢٣٦٣) قال الالباني: واستغربه الترمذي ولكن اسناده صحيح على شرط مسلم وصححه ابن حبان (٢١٣٩ و ٢٥٥٠) والبغوي.

**واتە: پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ [ئەوەندە تەوەکولی بەخوای پەروەردگار بەهێزبوو] هیچی پاشەکەوت نەدەکرد بۆ خۆی بۆ سبەینێ.**

(٢٨٤) **في الصحيحين: (أنه ﴿ﷺ﴾ كان يدخر لأهله قوت سنتهم).**

واتـە: پێغەمبـەری خـوا ﴿ﷺ﴾ خـواردنی سـاڵێکی هەڵـدەگرت وپاشـەکەوتی دەکـرد بـۆ کەس و کارو خێزانەکانی [ چونکە ئەوان وەك ئەو نەبوون ].

(٢٨٥) **عن عائشة (رضي الله عنها ) :(أن النبي ﴿ﷺ﴾ كان يَقبَلُ الهَديّة، و يثيبُ عليها).** أخرجه الترمذي وقال: حديث حسن صحيح ،الارواء (١٦٠٢) واحمد والبخاري وابو داود (٣٥٣٦).

واتـە: پێغەمبـەری خـوا ﴿ﷺ﴾ دیـاری وەردەگـرت و پاداشـتی خاوەنەکەشـی ئەدایـەوە بەچاکە [ئەمەش نیشانەی بەوەفایی‌یە].

**وە شەرمی پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ زیاتر بووە لەشەرمی ئەو کچە عازەبەی کـە دەچـێتە پشـت پەردەکەیـەوە. وە ئەگـەر شـتێکی پـێ نـاخۆش بوایـە بەڕووی‌دا دەردەکـەوت (٢٨٦) وە کـە دڵخـۆش دەبـوو ڕووی وەك لەتـە مـانگ دەدرەوشایەوە(٢٨٧) . لە هەموو کەس ئازاترو سەخی تر بووە (٢٨٨) .**

---

(٢٨٦) **عن ابي سعيد الخدري قال:( كان ﴿ﷺ﴾ أشَدّ حياءً من العذراء في خِدرِها، وكان إذا كره شيئاً عُرِف في وجهه).** اخرجه البخاري و مسلم و وابن ماجه (٤١٨٠) واحمد وغيرهم وابو الشيخ (٣٩ و٤٠) و له عنده شاهد من حديث انس (رضي الله عنه).

واتە: پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ زۆر شەرمی زیاتر بووە لە شەرمی ئەو ئافرەتە گەنجەی کە دەچێتە پشت پەردەوە. وە ئەگەر شتێکی پێ ناخۆش بوایە دەم و چاوی تێك دەچوو [ئیتر بەوەدا دەیانزانی ئەو شتەی پێ ناخۆشە].

(٢٨٧) **(كان إذا سُرَّ استنار وجهَهُ كأنه قطعة قمر)** . صحيح جامع الصغير . مجلد (٤) رقم (٤٦١٥).

واتـە: پێغەمبـەری خـوا﴿ﷺ﴾ کـە دڵ خـۆش بووایـە ڕووی گـەش و دراوەشـاوە دەبـوو دەتوت لەتە مانگە.

(٢٨٨) **(كان أحسن الناس و أجود الناس وأشجعَ الناس).** صحيح جامع الصغير مجلد (٤) (٤٥١١).

واتە: پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ لە هەموو کەس چاکترو سەخی ترو لە هەموو کەس ئازاتر بووە.

**( كان رسول الله ﴿ﷺ﴾ أحسن الناس وجهاً، وكان أجود، وكان أشجع الناس. ولقد فزع أهل المدينة ذات ليلة، فأنطلق ناسٌ من قبل الصوت، فتلقاهم الناس رسول الله ﴿ﷺ﴾ راجعاَ، وقـد سبقهم إلى الصوت،** وفي رواية : **وقد استبرأ الخبر وهو على فرس عـُري لأبي طلحة، في عنقه السيف وهو يقول: ((لن تراعوا))، قال: وجدناه بحراً، أو أنه لبحر، قال: وكان فرساً يُبَطَّأ )** متفق عليه.

واتـە: پێغەمبـەری خـوا ﴿ﷺ﴾ ڕووی لـە هـەموو کـەس جوانترو لەهـەموو کـەس سـەخی تـرو ئـازاتر بـووە. شـەوێکیان دەنگێکـی گـەورە هـات خـەڵکی مەدینـە ترسـان. خەڵکەکـە

ڕووەو دەنگەکــە چــوون. کاتێکیــان زانــی پێغەمبــەری خــوا ﴿ﷺ﴾ بــەرەو ڕوویــان دەگەڕایەوەو پێش ئەمان چوو بوو هەواڵەکەی زانی بوو. بەسەر ئەسپێکی پشت ڕووتی بێ کۆپانـەوە بـوو کـەهی ابـو طـەلحـە بـوو. شمشێرەکەشـی لـە مـل کردبـوو دەیفـەرموو: مەترسن ترستان لەسەر نىیە. دەفەرموی: ئەسپەکەی دەتوت دەریایە ئەوەندە خێرا بوو لەکاتێکدا پێشتر ئەو ئەسپە زۆر خاوو تەمبەڵ بوو.

## کەڵەشاخ گرتنی

**پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ کەڵەشاخی گرتووە و(أبو طَيبه) بۆی کردو ئەویش لـە بریـدا دوو(صـاع) خـواردنی دایە(کـە هـەر صـاعێك نزیکـەی چوارمشـت دەگرێـت) وە دەیفـەرموو: چـاکترین دەرمانـە (٢٨٩). وە لەسـەر هـەردوو لاملـی وە لە نێوان هەردوو شانىدا گرتوویەتی (٢٩٠).**

---

(٢٨٩) **عن حُمَيدٍ قال:سئل أنس بن مالك عن كسب الحَجّام؟ فقال: إحتجم رسول الله ﴿ﷺ﴾ حجمه (أبو طَيبة)، فأمرله بصاعين من الطعام، وكلم اهله ، فوضعوا عنه من خَراجه، وقال: ((إن أفضل ما تداويتم به الحجامة، أو: إن من أمثل ما تداويتم به الحجامة))** .أخرجه الترمذي (١٢٧٨) وقال: حديث حسن صحيح ،والبخاري (١٠٦٥) ومسلم (٦٢) وابو داود وغيرهم.

واتە: پرسیار کرا لـە ئەنەسـی کـوڕی مالك دەربارەی کرێـی کەڵەشاخ گر؟(ئەو کەسـەی کارەکـە دەکـات بـۆ خـەڵکی)؟ فـەرموی: پێغەمبـەری خـوا﴿ﷺ﴾ کەڵەشـاخی گرتـووەو ابـو طەيبە[ کەناوی نافع بووەو بەندەی نەوەی حارثە یان ابی مسعود الانصاری بووە ] بۆی کرد. ئەویش فەرمانی کرد دوو صاع [کەهەر یەکێکیان چوار مشت دەگرێـت ] خـواردنی بدەنىۆ قسـەی لەگـەڵ کـەس و کارەکەیـدا کـردو فـەرموی: چـاکترین شـتێك کـە دەرمـانی خۆتانی پێ بکەن کەڵەشاخ گرتنە [ئەمەش خیطابە بۆ ئەهلی حیجازو دانیشتوی وولاتـە گەرمەکان. وە کەڵەشاخیش دەگۆڕێ بە گۆڕانی کاتو شوێنو میزاج ].

**وعن علي :(أن النبي ﴿ﷺ﴾ إحتجم، وأمرني فأعطيت الحَجّام أجره).** أخرجـه ابـن ماجـه (٢١٦٣) وأحمد ٩٠/١ و ١٣٤ و ١٣٥ وسنده ضعيف ولكن ينجبز بما قبله وما بعده.

واتـە: پێغەمبـەری خـوا ﴿ﷺ﴾ کەڵەشـاخی گـرتو فـەرمانی پـێ کـردم منـیش کرێـی کەڵەشـاخ گرەکەم دا.

**وعن ابن عمر: ( أن النبي ﴿ﷺ﴾ دعا حَجّاماً فحجمه ، وسأله: ((كم خراجك؟)) فقال: ثلاثة آصُعٍ. فوضع عنه صاعاً، وأعطاه أجره)** . أخرجه أحمد ٣٥٣/٣ وابن سعد وصححه الالباني.

واتە: پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ کەڵەشاخ گرێکی بانگ کردو کەڵەشاخی بۆ گرت و پرسیاری لـێ کرد: کرێیەکەت چەندە؟ ووتی: سێ صاع. ئەویش صاعێکی لىێدا شکاندو کرێ یەکەی دایە.

(٢٩٠) **عن ابن عباس أظنه قال:(إن النبي ﴿ﷺ﴾ إحـتجم علـى الأخـدَعَين وبـين الكـتفَين. وأعطى الحَجّام أجره، ولو كان حراماَ لم يُعطه).** أخرجه ابو داود (٣٤٢٣) والبخاري ومسلم بلفـظ:**(حَجم**

**النبي ﴿ﷺ﴾ عبدٌ لبني بياضة فأعطاه النبي ﴿ﷺ﴾ أجره، وكلم سيده، فخفف عنه من ضريبته ولو كان سحتاً لم يعطه النبي ﴿ﷺ﴾).**

واته: پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ کەڵەشاخی گرت لەسەر هەردوو دەماری ئەملاولای ملی. وەلەنێوان هەردووشانیداو کرێی کەڵەشاخ گرەکەیدا، خۆ ئەگەر حەرام بوایە نەیدەدایە. لە ریوایەتەکەی تردا: پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ عەبدێکی بەنی بیاضە کەڵەشاخی بۆ گرت وئەویش کرێیەکەی دایە و قسەی لەگەڵ خاوەنەکەیدا کردو ئەویش لە کرێیەکەی داشکاندو ئەگەر حەرام بوایە پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ نەیدەدایە.

**یان لەسەر سەرەوەی پشتیو ناوشانی. وەله(١٧و١٩و٢١)یمانگدا دەیگرت (واتەمانگیکۆچی)[٢٩١] وەلەسەر پشتی قاچیدا کردویەتی لەبەر ئازارێك کە تیایدابوو[٢٩٢] .**

## تەمەنی پڕ خێری پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾

**سیانزە (١٣)ساڵ لە شاری مەککە مایەوە وەحی بۆ دەهات و دە(١٠) ساڵیش لە مەدینەو لە تەمەنی شەستو سێ (٦٣) ساڵیدا وەفاتی کرد [٢٩٣] .**

---

(٢٩١)**عن أنس بن مالك(رضي الله عنه)قال:(كان رسول الله ﴿ﷺ﴾ يحتجم في الاخدعين والكاهل، وكان يحتجم لسبع عشرة، وتسعةعشرة، واحدى وعشرين).**أخرجه الترمذي(٢٠٥٥)وابن ماجه(٣٤٨٦)وقال الترمذي:حديث حسن غريب ،وصححه الحاكم على شرط الشيخين و وافقه الذهبي وصححه الالباني وله شواهد انظر(الصحيحة)(٩٠٧).

**واتە: پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ کەڵەشاخی لەسەر هەردووڕەگی ئەملاولایملیو ناوشانی دەگرت و لەکاتێکدا دەیکرد کە حەڤدە یان نۆزدە یان بیست و یەك شەو لە مانگەکە ڕۆشتبێ.**

(٢٩٢)**وعنه: (ان رسول الله ﴿ﷺ﴾ إحجتم وهو مُحرِمٌ بـ(ملل)على ظهر القدم).**أخرجه الترمذي وقال الالباني:إسناده صحيح علىشرط الشيخين،وأخرجه أحمد٣/١٦٤وعنه أبوداود(١٨٣٧)والنسائي دونقوله:((بملل))وزاد((**من وجع كان به**))

**واتە: پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ کەڵەشاخیگرت لەکاتێکدا لە ئیحرامدا بوو لە (مەلەل) [کە شوێنێکە لە نێوان مەککەو مەدینەو حەڤدە میل دوورە لە مەدینەوە ]یان لەسەر پشتی قاچیدا گرتی [لەبەر ئازارێك کەتیایدا بوو].**

(٢٩٣) **عن ابن عباس قال: (مَكَث النبي ﴿ﷺ﴾ بمكة ثلاث عشرة سنة يوحى اليه. وبالمدينة عشراً، وتوفي وهو ابن ثلاثٍ وستين)** . أخرجه الترمذي (٣٦٢٥) وقال: حديث حسن صحيح. وغيره كالبخاري مختصراً ومسلم.

**واته: پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ لە شاری مەککەدا (سیانزە) ساڵ مایەوە کە وەحی بۆ دەهات و لە مەدینەشدا (دە)ساڵ و کاتێ وەفاتی کرد تەمەنی (٦٣) ساڵ بوو.**

**هەروەها أبو بەکروعومەر یش (ڕەزای خوایان لێ بێتْ)(٦٣) ساڵ ژیان** [٢٩٤] .

---

**عن عائشة: (أن النبي ﴿ﷺ﴾ ماتَ وهو ابن ثلاث وستين سنة)** . اخرجه الترمذي (٣٦٥٤) وقال: حسن صحيح، والبخاري ومسلم وأحمد.

**واته: پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾لەتەمەنی (٦٣) ساڵیدا بوو وەفاتی کرد.**

**بەلاْم ئەم فەرمودەیەی کەدەفەرموێت: أبن عباس فەرمویەتی: (توفي رسول الله وهو ابن خمس وستين)**. أخرجه الترمذي (٣٦٥٢) ومسلم.

**واته: پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ لەتەمەنی (٦٥) ساڵیدا وەفاتی کرد !!**

**دەربارەی ئەم فەرمووودەیە محمدی کوڕی اسماعیل دەفەرموێ: ڕیوایەتی شەستو سێ زۆرترە. ئیمامی نەوەوی(ڕەحمەتی خوای‌لێ بێت) دەفەرموێ: ئەویان راست ترەو مەشهورترە. عروەش ئینکاری ڕیوایەتەکەی ابن عەباس دەکاو دەفەرموێ: ئەو(واتە عبداللەی کوڕی عەباس) نەگەیشتووە بە سەرەتای پێغەمبەرایەتی .**

**ئیمامی ئەلبانی(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێ: ( بەڵکو ئینکاریەکە لەسەر ئەو کەسەیە کە لە ابن عەباسەوە دەیگێڕێتەوە چونکە لە ابن عەباسەوە بە صەحیحی هاتووە هەروەك ڕیوایەتی زۆرەکەو پێشتر هێنرایەوەو ئەوەشە کە پشتی پێ دەبەسترێ هەروەك الحافظ ابن حجر دەفەرموێ. وە هەر فەرمودەیەکی تر کە پێچەوانەی ئەوەی یەکەمە یان شازە یان تەئویل دەکرێ ...).**

(٢٩٤) **عن جرير عن معاوية انه سمعه يخطب قال: (مات رسول الله﴿ﷺ﴾ وهو ابن ثلاث وستين، وأبو بكر وعمر، وأنا ابن ثلاث وستين).** أخرجه مسلم و الترمذي (٣٦٥٥) وقال حديث حسن صحيح، وأحمد ٤/٩٦و٩٧ و ١٠٠ .

واتـە: جـەرير دەفـەرمویٚ: لـە مەعاويـەوە دەگێڕێتـەوە کـەوا لىٚـى بيسـت دەيفـەرموو: پێغەمبەرى خوا ﷺ لەتەمەنى شەستو سىٚ ساڵيدا وەفاتى كردووە، هەروەها أبو بكرو عومەريش. وەهەروەها منيش تەمەنم شەستو سىٚيە [ ئيمامى نەوەوى دەفەرمویٚ: واتـە تەوەقع دەكەم كە وەكو ئەوان لەم تەمەنەمدا كە شەستو سىٚيە وەفات بكەم ].

قەسطەلانى دەفەرمویٚ: (معاويـە(ڕەزاى خـواى لـىٚ بێـت) پـێش پێغەمبەرايـەتى بـە پێـنج ساڵ لـە دايك بووەو دواى ئـەو ساڵەى كـە (ئەمـەى فـەرموو) مردنـى دواكـەوت و نزيكـەى هەشتا ساڵ ژيا).

## وەفات كردن و بەخاك سپاردنى

پێغەمبەرى خوا ﷺ ئەو ڕۆژەى كە تيايدا وەفاتى كرد پەردەى ژوورەكەى لاداو كۆتـا تەماشـا تەماشـاى هاوەڵـەكانى كـرد كـە أبوبـەكرى صـديق(ڕەزاى خواى لىٚ بێت) پێش نوێژى بۆ دەكردن[٢٩٥]. وە لە كـاتى سـەرەمەرگىدا دەسـتى دەخسـتە نـاو ئـاوەوەو دەهێنـا بەڕوويـداو دەپاڕايـەوە [٢٩٦] وە زۆر ناڕەحـەت بوو[٢٩٧].

---

(٢٩٥) **عن أنس بن مالك قال: (آخرُ نظرةٍ نظرتُها إلى رسول الله ﷺ، كَشف الستارة، يوم الاثنين، فنظرت الى وجهه كأنه ورقة مصحف، والناس خلف أبي بكر، فكاد الناس ان يضـطربوا، فأشار إلى الناس ان اثبتوا، وأبوبكر يؤمهم، وألقى السَّجف. وتوفي رسول الله ﷺ من آخـر ذلك اليوم).** اخرجه البخاري ومسلم والنسائي وابن سعد (٢١٦/٢) وأحمد (١١٠/٣) وسنده ثلاثي. انظر مختصر البخاري (٣٧٤).

واتـــە: كۆتـــا بينێنـــێكم بـــۆ پێغەمبـــەر ﷺ لـــە ڕۆژى دووشـــەممەدا بـــوو، پـــەردەى ژوورەكەى لادا، تەماشاى ڕووى جوانيم كرد دەتوت پەڕەى قورئانە. خەڵكەكەش لە دواى ئەبو بەكرەوە نوێژيان دەكرد خەريك بوو ڕيزەكان تێك بدەن. بۆيە ئاماژەى بۆ كردن كە لـە شـوێنى خۆتـان بچەسـپێنو ئـەبو بـەكريش بەرنوێـژى دەكـرد بۆيـان، ئـيتر پەردەكـەى دادايەوەو لەكۆتايى ئەو ڕۆژەدا پێغەمبەرى خوا ﷺ وەفاتى كرد.

(٢٩٦) **( جعل النبي ﷺ عند موته يُدخل يَديه في الماء فيمسح بهما وجهه ويقول: ((لا اله الا الله إن للموت لسكرات)).** البخاري مع الفتح ١٤٤/٨ وفي الحديث السواك.

واتـە: پێغەمبـەرى خـوا ﷺ لەسـەرمەرگدا هـەردوو دەسـتى دەخسـتە نـاو ئـاوەوەو دەيهێنا بە ڕوىداو دەيفـەرموو: هـيچ پەرسـتراوێك نىيـە بەحـەق جگـە لـە (اللە). بەڕاسـتى مردن ناڕەحەتى خۆى هەيە.

وه دەیفەرموو: **((اللهم اغفرلي وارحمني وألحقني بالرفيق الأعلى))** .البخاري ١٠/٧ ومسلم ١٨٩٣ .

**واتە: خوایە لێم خۆش بەو ڕەحمم پێ بکەو بمگەیەنە بە هاوڕێیانی پلە بەرز[ کە بریتین لە پێغەمبەران و ڕاست گۆیان و شەهیدان و پیاوچاکان].**

(٢٩٧) **وعن عائشة قالت: (لاأغبطُ أحداً بهون موتٍ، بعد الذي رأيتُ من شِدّة موت رسول الله ﷺ).** أخرجه الترمذي (١٠١٨) وقال الالباني: وأستغربه الترمذي لأن فيه عبدالرحمن بن ابي بكر المليكي. لكن الحديث صحيح بما له من الشواهد. (الاحكام الجنائز) ص ١٣٧ و ١٣٨.

**واتە:هەرگیز ئاوات بە ئاسان مردنی کەس ناخوازم کە بە ئاسانیو بێ نارەحەتی بمرێت. دوای ئەوەی کە بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ چەند نارەحەت بوو کە وەفاتی کرد.**

**لەبەر سینگو بەرۆکی عائیشەدا بوو کە وەفاتی کرد[٢٩٨]. ئەوەندە نارەحەت دەبوو فاطمەی کچی دەیفەرموو:(وأ كرباه) یان(وا كرب أبتاه) واتە: ئایباوکم چەند نارەحەتە. ئەویش دەیفەرموو: ئیتر لەمڕۆ بەدواوە باوکت نارەحەتی توش نابێو باوکت شتێکی پێ گەیووە(کە مردنە) کەس ڕزگاری نابێ لێی[٢٩٩]. وە ئەبوبەکر دوای وەفات کردنی پێغەمبەر ﷺ ناو چاوی ماچ کردو هەردوو قۆڵی گرتو فەرمووی: وانبیاه، وا صفیاه، وا خلیلاه[٣٠٠]**

---

(٢٩٨) **عن عائشة قالت: (كنت مسندة النبي ﷺ إلى صدري، أو قالت: الى حجري، فدعا بطست ليبول فيه، ثم بال فمات)** قال الالباني: اسناده صحيح على شرط مسلم. اخرجه الترمذي والنسائي وابن سعد ٢٦٠/٢ ٢٦١ وفي رواية للبخاري: **( قبضه الله و إن رأسه لبين سحري ونحري).**

**واتە: عائیشە(ڕەزای خوای لێ بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ خۆی دابوو بە سنگمەوە، یان بە بەرۆکمەوە. وە بوبووم بە کۆڵەکە بۆی جا داوای تەشتێکی کرد تا میزی تیا بکات پاشان میزی کردو وەفاتی کرد. لە ڕیوایەتەکەی بوخاریدا: کە خوای گەورە گیانی کێشا، پێغەمبەری خوا ﷺ سەری پیرۆزی بە بەرۆك و سنگمەوە بوو.**

(٢٩٩) **عن أنس بن مالك قال: لما وجد رسول الله ﷺ من كرب الموت ما وجد، قالت فاطمة (رضي الله تعالى عنها): وا كرباه ! فقالِ النبي ﷺ:(( لا كرب على أبيك بعد اليوم. إنه قد حضر من أبيك ما ليس بتارك منه أحداً، والموافاة يوم القيامة ))** اخرجه البخاري وأبن ماجه (١٦٢٩) وهو حسن. وأحمد ١٤١/٣ وسنده حسن وصححه الالباني (الصحيحة) ( ١٧٣ ).

**واتە:کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەرەمەرگدا نارەحەتی زۆری بۆ هێنا. فاطمەی کچی فەرمووی: ئای باوکم چەند نارەحەتە. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئیتر لەم ڕۆوە باوکت نارەحەتی لەسەر نییە، مردنێك هاتۆتە سەر باوکت هیچ کەسێك دەربازی نابێ لەدەستی [کەواتە موسیبەتەکە گشتییە] وە وەفاو بە یەکتر گەیشتنەوەش لە ڕۆژی دوایدایە.**

(٣٠٠) **وعن عائشة:(أن أبا بكر دخل على النبي ﴿ﷺ﴾ بعد وفاته فوضع فمه بين عينيه، ووضع يده على ساعديه وقال: وا نبياه ! وا صفياه ! وا خليلاه).** أخرجه الترمذي وأحمد ٣١/٦ مختصراً كما هنا و ٢١٦/٦ مطولاً وكذا ابن سعد ٢٦٧/٢ وحسن اسناده الالباني.

**واتـه: دواى وەفـاتى پێغەمبـەر ﴿ﷺ﴾ ئەبـابكر هاتـە سـەرىو دەمـى خسـتە سـەر ناوچەوانىو ماچى كردو هەردوو دەستى خستە سەر هەردوو باسكىو فەرمووى: واى پێغەمبەرەكەم، واى بێتاوان و هەڵبژاردەكەم، واى هاوڕێ خۆشەويستەكەم.**

**وعن ابن عباس وعائشة: (أن أبابكر قبّل النبي ﴿ﷺ﴾ بعد ما مات).** أخرجه الترمذي (٩٨٩) وقالت: حسن صحيح، وابن ماجه وغيرهم وقال الالباني: إسناده صحيح على شرط مسلم. وزاد النسائي: **(بين عينيه).**

**واتە: ئەبوبەكر ماچى نێوچەوانى پێغەمبەرى ﴿ﷺ﴾ كرد دواى وەفات كردنى.**

**وە بـەر لـە وەفـات كردنــى خـواى گـەورە شـوێنى خـۆى نيشـانداوە لـە بەهەشتداو سەرپشكى كردبوو كە ئايا ژيانى دونياى دەوێ يان گەڕانەوە بۆ لاى خۆىو پاداشتى نەبڕاوە، ئەويش دووەمى هەڵبژارد[٣٠١] . وە هەر وەك چۆن ژيانى ڕەحمەت بوو وەفات كردنيشى هەر ڕەحمەت بوو [٣٠٢] .**

---

(٣٠١)**ڕۆژێكيان پێغەمبەرى خوا ﴿ﷺ﴾ فەرمووى:((ان الله خَيّر عبداً بين الدنيا، وبين ما عند الله، فأختار ذلك العبد ما عند الله))، فبكى ابو بكر.** /رواه البخاري.

**واتە: خواى گەورە بەندەيەكى سەرپشك كرد لەنێوان ژيانى دونياو لەگەڵ ئەوەى كە لەلاى خواى گەورە هەيە لە گەڕانەوەىدا تاكاميانى دەوێ بيداتێ. ئەو بەندەيەش ئەوەى هەڵبژارد كە لەلاى خوايە لەخۆشىو نيعمەت و پاداشت. بۆى ەئەبوبەكر [زانى مەبەستى خۆيەتى] دەستى كرد بە گريان.**

**و عن عائشة قالت: ( كان رسول الله ﴿ﷺ﴾ يقول وهو صحيح: ((إنه لم يقبض نبيّ حتى يرى مقعده من الجنة، ثم يخير بين الدنيا والآخرة)) . قالت عائشة: فلما نزل به- ورأسه على فخذي - غشي عليه، ثم أفاق فأشخص بصره الى السقف، ثم قال: (( اللهم الرفيق الاعلى)). قلت: إذاً لا يختارنا. قالت: وعرفت انه الحديث الذي كان يُحدثنا به وهو صحيح).** متفق عليه.

**واتە: پێغەمبەرى خوا ﴿ﷺ﴾ كاتێ لەش ساغ بوو دەيفەرموو: هيچ پێغەمبەرێك ڕۆحى نەكێشراوە هەتا شوێنەكەى خۆى پيشان نەدرابێ لە بەهەشتدا. پاشان سەرپشك دەكرێت لەنێوان دونياو قيامەتدا. عائيشە فەرمووى: كاتێك سەرەمەرگى هات — وە سەرى لەسەر ڕانم بوو — بوورايەوە، پاشان هۆشى هاتەوەو چاوى بەرەو سەقفەكە بەرز كردەوەو ئينجا فەرمووى: خوايە بمگەيەنە بەهاورێيانى پلە بەرز [لە پێغەمبەرانو ڕاست گۆيان و شەهيدان و پياوچاكان ] دەفەرموێ: منيش لە دەروونى خۆمدا وتم:**

کەواتە ئێمە هەڵنابژێرێت . دەفەرمووێ: وە بۆم ڕوون بۆیەوەو زانیم ئەوە ڕاستێتی ئەو فەرموودەیەیە کە لەکاتێکدا لەش ساغ بوو بۆی باس دەکردین.

(٣٠٢) **قال (ﷺ): (( إن الله عز وجل إذا أراد رحمة أمةٍ من عباده قبض نبيها قبلها، فجعله لها فَرَطاً وسَلَفاً بين يديها، وإذا أراد هلكة أمة، عذبها و نبيُّها حيٌّ. فأهلكها وهو ينظر ، فأقرّ عينه بهلكتها حين كذبوه ، وعصوا أمره)).** رواه سلم.

واتە: خوای گەورە ئەگەر ویستی ڕەحمەتی هەبێت بە گەلێك لە بەندەكانی گیانی پێغەمبەرەكەیان لە پێشیانەوە دەكێشێ‌و دەیكاتە پێشەكی‌یەك لەبەردەمیانەوە، وە ئەگەر ویستی بەهیلاك بردنی گەلێكی هەبێت سزایان دەدات لە كاتێكدا پێغەمبەرەكەیان زیندوەو كاتێ بەدرۆیان خستەوەو سەرپێچیان كردبەهیلاكیان دەبات و ئەویش تەماشا دەكات و چاوی پێغەمبەرەكە شادو ڕۆشن دەكاتەوە بە لەناوبردنیان.

سا ئیتر دوای وەفات كردنی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەو ڕۆژە بەلای هاوەڵانەوە زۆر ناخۆش بوو. بەجۆرێك شاری مەدینەیان لەلا تاریك بوو. دوای ناشتن‌و بە خاك سپاردنی ڕقیان لەدڵی خۆیان دەبوەوە [٣٠٣] .وە لە ڕۆژی دووشەممەی ساڵی (١١)ی كۆچی‌دا وەفاتی كرد دوای ئەوەی پەیامەكەی ڕاگەیاندو خوای گەورە دینەكەی خۆی پێ تەواو كرد [٣٠٤] . وە لەكاتی ناشتنی‌دا جیاوازی كەوتە نێوان هاوەڵانەوە كە ئاخۆ لە كوێ‌دا بینێژن، تا ئەوە بوو ئەبو بەكر(ڕەزای خوای لێ بێت) چارەسەری گرفتەكەی

---

(٣٠٣) **عن أنس قال: ( لمّا كان اليوم الذي دخل فيه رسول الله (ﷺ) المدينة، أضاء منها كلُّ شيء، فلما كان اليوم الذي مات فيه أظلم منها كل شيء، وما نَفَضنا أيدينا من الترابِ وإنا لفي دفنه حتى أنكرنا قلوبَنا ).** أخرجه الترمذي (٣٦٢٢). وقال : حديث صحيح غريب: وابن ماجه وصححه ابن حبان (٢١٦٢) والحاكم ٥٧/٣ على شرط مسلم و وافقه الذهبي.

واتە: ئەو ڕۆژەی كە پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاتە ناو شاری مەدینەوە هەموو شتێكی‌شار لەبەر چاومان ڕووناك بوویەوە، بەڵام ئەو ڕۆژەی كە وەفاتی كرد تیایدا هەموو شتەكان تاریك بوون و هێشتا خۆڵی دەستمان نەتەكاندبوو خەریكی بەخاك سپاردن و دفن كردنی بووین ڕقمان لەدڵی خۆمان دەبوویەوە. [كە ئەمەش گوزارشت دەكات لەنارەحەتی‌یەكی زۆر كە بە ماڵئاوایی كردنی بەڕێزترین

پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ توشیان بوو، بۆیە ڕقیان لەخۆیان بوەتەوە لەخەفەت باریو بێ تاقەتیدا، چونکە هاوەڵە خۆشەویستەکەیان کۆچی کردو ئیتر وەحی نایەتو کۆتایی پێ هات].

(٣٠٤) **عن عائشة قالت: (توفي رسول الله ﴿ﷺ﴾ يوم الاثنين).** أخرجه البخاري مختصر البخاري (٦٩٢) والطيالسي وأحمد ٦/٤٥ و ١١٨ و ١٣٢.

**واتە: پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ لە ڕۆژی دووشەممەدا وەفاتی کرد.**

**کردو فەرمانی کرد لە شوێنی وەفات کردنیدا بینێژن[٣٠٥]. وەشەوی چوارشەممە لە کۆتایی شەودا بە خاکیان سپارد. واتە دووشەو بەم شێوە مایەوەو وەستان لە بەخاك سپاردنی، ئەویش لەبەر دیاری کردنی جێنشینێك لەدوای پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ کە ئەویش ئەبو بەکری صدیق بوو (ڕەزای خوای لێ بێت)[٣٠٦].**

---

(٣٠٥) **عن عائشة قالت: لما قُبض رسول الله ﴿ﷺ﴾ اختلفوا في دفنه، فقال أبو بكر: سمعت من رسول الله ﴿ﷺ﴾ شيئاً ما نسيته، قال: (( ما قبض الله نبياًإلا في الموضع الذي يحب ان يدفن فيه)). أدفنوه في موضع فراشه.** /أخرجه الترمذي (١٠١٨) قال الالباني: وأستغربه الترمذي لأن فيه عبدالرحمن بن ابي بكر المليكي. لكن الحديث صحيح بما له من الشواهد كما هو مبين في( احكام الجنائز) ص (١٣٧ و ١٣٨).

**واتە: کاتێ پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ وەفاتی کرد ناکۆکی کەوتە نێوانیانەوە لەسەر ناشتنی. تا ئەبوبەکر فەرمووی: من شتێکم بیستووە لە پێغەمبەرەوە ﴿ﷺ﴾و بیرم نەچۆتەوە، فەرموویەتی: خوای گەورە گیانی هیچ پێغەمبەرێکی نەکێشاوە ئیلا لەو شوێنەدا نێژراوە کە خۆی حەزی کردووە لێی بنێژرێ. دەی سا لەو شوێنەدا کە جێگەی نوستنی بووە بینێژن.**

(٣٠٦) **عن جعفر[ الصادق] بن محمد عن أبيه [ وهو محمد الباقر بن علي بن زين العابدين بن الحسين وهو من التابعين فالحديث مرسل ] قال: قُبض رسول الله ﴿ﷺ﴾ يوم الاثنين، فمكث ذلك اليوم، وليلة الثلاثاء، و دُفِنَ من الليل. (قال (سفيان): وقال غيره: يُسمَعُ صوت المَساحي من آخر الليل).**أخرجه الترمذي . وقال الالباني: اسناده صحيح رجاله كلهم ثقات رجال مسلم لكنه مرسل... وقد روي معناه عن علي (رضي

الله عنه) أخرجه ابن سعد ٢٧٣/٢ وله شاهد عن عائشة قالت: **(توفي النبي ﴿ﷺ﴾ يوم الاثنين ودفن ليلة الاربعاء).** اخرجه أحمد ١١٠/٦ ورجاله ثقات، ثم روى ٢٧٤/٦ بسند جيد عنه ا**:(ما علمنا بدفنه ﴿ﷺ﴾ حتى سمعنا صوت المساحي من جوف الليل. ليلة الاربعاء).**

**واته: پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ ڕۆژی دووشەممە وەفاتی کرد، ئەو ڕۆژەو شەوی سێشەممەش مایەوە، تا شەوی چوار شەممە لە شەودا نێژرا. سوفیانی کوری عویەینە دەفەرموێ: وە جگە لە (محمد الباقر) یش فەرموویانە: لە کۆتایی شەودا دەنگی بێڵو خاکەناز دەبیسترا، لەڕیوایەتەکەی (ئیمامی أحمد) دا عائیشە دەفەرموێ: ئێمە بەناشتنی پێغەمبەرمان ﴿ﷺ﴾نەزانی هەتا گوێمان لە دەنگی خاکەناز بوو لە ناوەڕاستی شەوی چوارشەممەدا.**

**وە لە پێش وەفات کردنی‌دا چەند جاریك بوورایەوەو کە هۆشی دەهاتەوە دەیفەرموو: با بیلال بانگ بدات وئەبو بەکر بەرنوێژی بکات، دوای وەفات کردنیشی هاوەڵەکان زۆر بێ تاقەت بوون کاتێ هەواڵی وەفات کردنیان بیست، بەجۆرێ عومەر (ڕەزای خوای لێ بێت) هەڕەشەی دەکرد لەو کەسەی کە بڵێ پێغەمبەر﴿ﷺ﴾مردووە، پاشان ئەبوبکر(ڕەزای خوای لێ بێت) هات‌و تێی گەیاندن کە وەفاتی کردووەو فێری کردن کەبەچ شێوازێك نوێژی لەسەربکەن و لە کوێ‌دا بینێژن و کێ بیشوات. پاشان بەیعەتیاندا بە ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێ بێت)، وە کرا بە خەلیفە (٣٠٧) .**

---

**(٣٠٧) عن سالم بن عُبيد - وكانت له صحبة - قال: (أغمي على رسول الله ﴿ﷺ﴾ في مَرَضه فأفاق، فقال: ((حضرت الصلاة؟). فقالوا: نعم. فقال: (( مُرّوا بلالاً فليؤذّن. ومروا أبا بكر أن يُصلي للناس))أو قال: (( بالناس)). قال : ثم أغمي عليه فأفاق فقال: ((حضرت الصلاة؟ )). فقالوا: نعم. فقال: (( مروا بلالاً فليؤذن. ومروا أبا بكر فليصل بالناس)). فقالت عائشة: إن أبي رجل أسيف إذا قام ذلك المقام بكى فلا يستطيع فلو أمرت غيره، قال : ثم أغمي عليه فأفاق ، فقال: ((مروا بلالاً فليؤذن، ومروا أبا بكر فليصل بالناس، فأنكن صواحب أو صواحبات يوسف))قال: فأمر بلالاً فأذَّن، وأمر أبابكر فصلى بالناس، ثم إنّ رسول الله ﴿ﷺ﴾ وجد خفّة، فقال: ((أنظروا لي من أتّكيءُ عليه)) فجاءت بريدة و رجل آخر فاتكأ عليهما، فلما رآه أبو بكر ذهب لينكص ، فأوْمأ**

**اليه أن يثبت مكانه، حتى قضى أبوبكر صلاته ، ثم إن رسول الله ﴿ﷺ﴾ قُبِضَ، فقال عمر: والله لا أسمع أحداً يذكر ان رسول الله ﴿ﷺ﴾ قبض الا ضربته بسيفي هذا، قال: وكان الناس أميّين لم يكن فيهم نبي قبله، فأمسك الناس، فقالوا: ياسالم إنطلق الى صاحب رسول الله ﴿ﷺ﴾ فادْعُه، فأتيت أبابكر وهو في المسجد، فأتيته أبكي دهشاً، فلما رآني قال [لي]: أقُبض رسول الله ﴿ﷺ﴾؟ قلت: إن عُمر يقول : لا أسمع أحداً يذكر أن رسول الله ﴿ﷺ﴾ قبض الا ضربته بسيفي هذا! فقال لي:انطلق، فانطلقت معه، فجاء والناس قد دخلوا على رسول الله ﴿ﷺ﴾ فقال: ياأيها الناس أفرجوا لي، فأفرجوا له، فجاء حتى أكب عليه ومسه، فقال:**﴿إنك ميت وانهم ميتون﴾[الزمر / ٣٠]**. ثم قالوا: يا صاحب رسول الله أقُبض رسول الله ﴿ﷺ﴾ ؟ قال: نعم، فعلموا أن قد صدق . قالوا: يا صاحب رسول الله. أيصلّى على رسول الله؟ قال: نعم، قالوا: وكيف؟ قال: يدخل قوم فيكبرون ويصلون ويدعون، ثم يخرجون، ثم يدخل قوم فيكبرون ويصلون ويدعون، ثم يخرجون، حتى يدخل الناس، قالوا: يا صاحب رسول الله! أيدفن رسول الله ﴿ﷺ﴾؟ قال: نعم، قالوا: أين؟ قال: في المكان الذي قبض الله فيه روحه. فان الله لم يقبض روحه الا في مكان طيب. فعلموا أن قد صدق. ثم أمرهم أن يغسله بنو أبيه، واجتمع المهاجرون يتشاورون، فقالوا:إنطلق بنا الى إخواننا من الانصار ندخلهم معنا في هذا الامر، فقالت الانصار: منا أمير، ومنكم أمير. [وفي رواية : فقال عمر: يا معشر الانصار! ألستم تعلمون أن رسول الله ﴿ﷺ﴾ قد أمر أبابكر أن يؤم الناس، فأيكم تطيب نفسه أن تقدم على أبي بكر؟ فقالت الانصار: نعوذ بالله أن نتقدم على أبي بكر]. فقال عمر بن الخطاب: من له مثل هذه الثلاثة: ﴿ ثانيَ إثنينِ إذ هما في الغار إذ يقول لصاحبه لاتحزن ان الله معنا﴾. من هما؟ قال: ثم بسط يده فبايعه، وبايعه الناس بيعةً حسنةً جميلة).** أخرجه ابن ماجه (١٢٣٤) والترمذي . قال الالباني: اسناده (أي ابن ماجه) والترمذي واحد. وهو صحيح كما قال البوصيري في الزوائد لكن ليس عنده قوله: (والله لا أسمع أحداً...) إلخ. وروى بعضه النسائي والطبراني في الكبير (٦٣٦٧) بتمامه. وبعضه في (الصحيح) من حديث عائشة وسهل بن سعد فانظرها إن شئت في (مختصر البخاري) (٣٦٦ – ٣٧٦).

**واتە: سالمی کوڕی عوبەید دەفەرموێ : پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ لە کاتی نەخۆشی‌یەکەی‌دا بوورایەوەو هۆشی هاتەوەو فەرموی: ئایا کاتی نوێژ هاتووە؟ ووتیان: بەڵێ. فەرمووی : دەسا بە بیلال بڵێن با بانگ بدات وبە ئەبوبەکر بڵێن با پێش نوێژی بۆ خەڵکەکە بکات، دەفەرموێ : پاشان بوورایەوەو هۆشی هاتەوەو فەرمویەوە: ئایا کاتی نوێژ هاتووە؟ وتیان : بەڵێ. فەرموی: دەسا بە بیلال بڵێن با بانگ بدات و ئەبوبەکر پێش نوێژی بۆ خەڵکەکە بکات. عائیشە فەرمووی: باوکم پیاوێکی‌دڵ نەرم وگریاناوی و**

خەفەتبارە وخەفەت زاڵە بەسەریدا، ئەگەر بچێتە ئەو پێش نوێژەوە دەست دەکات بە گریان و ناتوانێ . ئەگەر جەنابت فەرمان بکەیت کەسێکیتر بچێتە ئەو شوێنە. دەفەرموێ: پاشان بوورایەوەو هۆشی هاتەوە. فەرموی: بە بیلال بڵێن با بانگ بدات و با ئەبوبەکر نوێژ بۆ خەڵکەکە بکات ئێوەی ئافرەتان [ئەی عائیشە] لە هاوشێوەی هاورێیەکانی یوسف دەچن [لەوەدا کە دەرونتان پێچەوانەی ئەوەیە کە بەزوبان دەیڵێن، واتە: مەبەستت شتێکی ترە کە ناهێڵی باوکت پێش بکەوێت ] دەفەرموێ : فەرمان کرا بیلال بانگیداو ئەبوبەکر بەر نوێژی بۆ کردن، پاشان پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ هەستی بە لەش سووك بوونێك کرد فەرمووی: بزانن کێ هەیە یارمەتیم بدات و خۆم بدەم بەسەر شانیدا. تا ئەوە بوو بەریدەی [قبطی یان حەبەشی کە خزمەتکاری عائیشە بوو ] هات و پیاوێکی تریش [لە ڕیوایەتەکەی بوخاریو مسلم دا هاتووە: کە هاتە دەرەوە خۆی دابوو بەسەر شانی عەباسو پیاوێکی تردا ئەویش عەلی کوڕی ئەبی طالبە، وەوتراوە عەباسو فەضلی کوڕی بووە. دیارە بۆ کۆکردنەوەی هەموو ئەم ڕیوایەتانە ئەوەیە کە: چەند جارێك هاتووەتە دەرەوە]. ئەویش خۆی دا بەسەر شانیانداو کاتێ ئەبوبەکر پێغەمبەری﴿ﷺ﴾ بینی ویستی لە پێش نوێژییەکەی بێتە دواوە تا پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ پێش بکەوێت، بەڵام ئاماژەو ئیشارەتی بۆ کرد کە لە شوێنی خۆتدا بمێنەرەوە تا ئەوە بوو ئەبوبەکر نوێژەکەی تەواو کرد، پاشان پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ وەفاتی کردو﴿ﷺ﴾خوای گەورە گیانی کێشا. [هاوەڵان زۆر بێ تاقەت بوون بەجۆرێ ] عومەر دەیفەرموو: سوێند بەخوا هەر کەسێك لێی ببیستم بڵێ پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ وەفاتی کردووە ئابەم شمشێرە تێی دەسرەوێنم. دەفەرموێ: وە خەڵکەکەش نەخوێندەوار بوون وە پێش ئەویش پێغەمبەری تریان لە ناودا نەبووە بۆیە بێ دەنگ بوون. خەڵکەکە پێیان وتم: ئەی سالم بڕۆ بۆ لای هاوڕێکەی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾(واتە ئەبوبەکر) وە بانگی بکە. منیش ویستم بچم بۆ لای کە بینیم لەناو مزگەوتەکەدایە، بۆیە بە حەپەساویو گریانەوە چووم بۆلای، کاتێ منی بینی فەرمووی : ئایا پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ وەفاتی کردووە ؟ منیش وتم: عومەر دەفەرموێ: لە هەر کەسێك ببیستم و بڵێ پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ وەفاتیکردووە بەم شمشێرەم لێی دەدەم .ئەویش فەرمووی: بڕۆ بابچین. کاتێ چووین بینیمان خەڵکەکە چووبوونە ژوورەوە بۆلای پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾، ئەبو بەکر فەرمووی:

ڕێگاکە بەردەن. ئەوانیش ڕێگایان بۆ چۆڵکرد. چوو تا گەشتە سەریو ماچی کردو فەرمووی: تۆ دەمریتو ئەوانیش[واتەپێغەمبەرانیپێش تۆ]مردوون.

[لەڕیوایەتەکەی بوخاریدا هاتووە: لەعائیشەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرموویەتی: کاتێك پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾وەفاتی کرد ئەبوبەکر لە ( السُّنح﴾ واتە لەبەرزاییەکی مەدینەدا بوو. عومەریش هەستا بوو دەیفەرموو: **(والله ما مات رسول الله)** !! سوێند بەخوا پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾وەفاتی نەکردووە. تا ئەوەبوو ئەبوبەکر هاتەوەو سەری پێغەمبەریخوای﴿ﷺ﴾ لاداو ماچی کردو فەرمووی: (**بأبي أنت ،طبت حياً وميتاً ، والذي نفسي بيده لا يذيقنك الله الموتتيين أبداً)** واتە: باوکم بەفیدات بێ بەزیندوویی و بەمردویش هەر پاكو جوان بویت. سوێند بەو خوایەی نەفسی منی بەدەستە خوای گەورە دوو مردنت بێ ناچێژێت [ئەمەش ئاماژەیەك بوو بۆ ڕەت دانەوەی ئەو کەسانەی دەیانووت پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ زیندوو دەبێتەوەو جارێکیتر دەمرێت] پاشان ئەبوبەکر دەرچووە دەرەوەو فەرمووی:(**أيها الحالف على رسلك)**. واتە: ئەی سوێندخۆر لەسەر خۆبە [ئەی عومەر پەلەمەکە]،کاتێ ئەبوبەکر قسەی کرد عومەر دانیشت، وە ئەبوبەکر سوپاسو ستایشی خوای گەورەی کردو فەرمووی:(**ألا من كان يعبد محمداً فإن محمداً قد مات، ومن كان يعبد الله فإن الله حي لايموت)** واتە: هەر کەسێك موحەممەدی دەپەرست ئەوا موحەممەد مردو وەفاتی کرد، هەر کەسێك خوای دەپەرست ئەوا خوای گەورە زیندووەو نامرێت. پاشان فەرمووی: ﴿ إنك ميت وإنهم ميتون ﴾ وە فەرمووی: ﴿ وما محمدٌ إلاّ رسولٌ قد خَلَت من قبله الرسل، أفإن مات أو قتل انقلبتم على أعقابكم ، ومن يَنْقَلب على عَقِبَيه فلن يَضُرَّ الله شيئاً وسيجزي الله الشاكرين ﴾ آل عمران.

واتە: محمد پێغەمبەرێکەو لە پێش ئەوەوە پێغەمبەریتر ڕەوانەکراوە، ئایا ئەگەر بمرێت یان بکوژرێت ئێوە لە دین پاشگەز دەبنەوە. هەر کەسێك لە دین پاشگەز بێتەوە هیچ زیان بە خوای گەورە ناگەیەنێ وخوای گەورە پاداشتیسوپاس گوزاران دەداتەوە.دەفەرموێ: (**فنشج الناس)**. واتە: ئیتر خەڵکی دەستیان کردە گریان ]. [ڕیوایەتەکەی بوخاریو مسلم تەواوبوو]

پاشان وتیان: ئەی هاوەڵەکەی پێغەمبەری خوا ئایا پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ وەفاتی کردووە؟ فەرموی: بەڵێ .بۆیە زانیان کە ڕاست دەکات. وتیان: ئەی هاوەڵەکەی پێغەمبەرئایا نوێژ دەکرێت لەسەر پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾؟ فەرمووی:بەڵێ، وتیان: چۆن؟

فەرمووی: کۆمەڵێك دێنە ژوورەوەو نوێـژ دەکەن لەسـەری ودەپاڕێنـەوە پاشـان دەردەچنە دەرەوە،پاشان کۆمەڵێکیتر دێنە ژورەوەو نوێژی لەسـەر دەکەن ودەپاڕێنـەوەو دەردەچنە دەرەوە، بـەم شـێوەیە هـەتا هـەموویان دێنـە ژوورەوە. وتیـان: ئـەی هاوەڵەکـەی پێغەمبـەر ئایا پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ دەنێژرێت؟ فەرمووی: بەڵێ ، وتیان: لـەکوێ؟ فـەرمووی: هـەر لەو شوێنەدا کەخوای گەورە گیانی تێدا کێشاوە چونکە خوای گەورە لە شـوێنێکی پاکدا نەبووبێ گیانی نەکێشاوە. جا زانیان کە ڕاست دەکات. ئینجا فـەرمانی کـرد کـە کوڕانو خزمـانی بـاوکی بیشـۆن [ ئـەوە بـوو عـەلی شـۆردیو فـەضـلی کـوڕی عـەباسو ئوسـامە وشقران- خزمەتکارەکـەی پێغەمبـەری خـوا ﴿ﷺ﴾-ئاویـان دەکـرد بەبەردەستیدا] پـاش وەفـاتی پێغەمبـەر ﴿ﷺ﴾، کۆچـەرەکان (مهـاجرون) کۆبوونـەوە بـۆ مەسـەلەی خیلافـەتو ڕاوێژیان دەکرد ووتیان: بابچین بۆلای برا پشتیوانەکانمان (أنصار) وبەشداریان بکـەین لـەم کـارەدا [وە لـە سـەقیفەی(بەنی سـاعدە)دا کۆبوونـەوە] یـەکێك لـە ئەنصـارەکان [کەئـەویش حوبابی کـوڕی مُنـذِر بـوو] فـەرمووی: بـا ئـەمیرێك لـە ئێمـەو ئـەمیرێك لـە ئێـوە دابنێین. عومەر فەرمووی: ئەی کۆمـەڵانی ئەنصـار ئایـا نـازانن کـە پێغەمبـەری خـوا﴿ﷺ﴾ فەرمانی کرد بە ئەبابەکر کە پێش نوێژی بکات بـە خـەڵکی، جـا کامتـان دڵتـان ڕازی دەبێ کە پێش ئەبوبەکر بکەوێت؟ ئەنصارەکان وتیـان: پـەنا دەگـرین بـەخوا کـە پـێش ئەبوبـەکر بکەوین.

عومـەر فـەرمووی: کـێ هەیـە وەك ئـەم سـێ نموونـە چاکـەی تێـدا کۆبووبێتـەوە [واتـە غەیری ئەو کەسی تر نییە]: کە خوای گەورە دەربارەی دەفـەرموێ: ﴿ ثـاني اثـنين إذ هُمـا في الغار﴾ کەیەکێك بووە لـەو دووانـە [کـە لـە ئەشـکەوتەکەدا بـوون ]و خـوای گـەورە لەگـەڵ نـاوی پێغەمبەرەکەیـدا نـاوی بـردووە،﴿اذ يقـول لصــاحبه لاتحــزن﴾ کـە نـاوی دەبـات بـە هاوەڵەکـەی، وە ﴿ ان الله معنا﴾ کە خـوای گـەورەی لەگـەڵە [ئـەم سـێ فەزڵـە بەسـە بـۆی کـە ببێتە خەلیفە] ئایا ئەو دووانە کێو کێیە کە خوای گەورە لە ئایەتەکەدا باسیان دەکات؟ دەفـەرموێت: ئینجـا عومـەر دەسـتی ڕاخسـتو بەیعـەتی پـێداو خەڵکەکـەش بەدوایـدا بەیعەتێکی چاکی جوانیان پێدا.

## میراتی پێغەمبەر (ﷺ)

پێغەمبەری خوا(ﷺ) جگە لەمانە هیچی لە دوای خۆی جێ نەهێشت: چەکەکەی، وە هێسترەکەیو پارچە زەوییەك کە کردبوووی بە خێر[308] .

وە هیچ میراتییەکی جێ نەهێشت بۆ منداڵەکانی، بەڵام ئەبوبەکر(ڕەزای خوای لێ بێت) بەڵێنیدا کە نەفەقەیان بکێشێ [309] .

---

(٣٠٨) **عن عَمرو بن الحارث أخي جويرية -له صحبة - قال: (ما ترك رسول الله (ﷺ) إلا سلاحه، وبغلته، وأرضاً جعلها صدق**[illegible] بخاري والن[illegible]ي وأحمد ٤/٢٧٩ وابن سعد٢/٢١٦.

واتە: پێغەمبەری خوا(ﷺ) [illegible] هیچی لە پاش خۆی جێ[illegible] نەهێشت جگە لەچەکەکەی [وەکو شمشێرو ڕم و کڵاوو حە[illegible]بەکەی] وە هێستر[illegible]کەی [[illegible]کە ناوی دُلدُل بووە]وە پارچە زەوییەك [ کە بەشی خۆی بوو لە ز[illegible]ی فدكو خەیبە[illegible] بەنی نەضیر] دوای خۆی کردی بەخێر [لەبەر ئەوەی فەرموویە[illegible] ئێمە[illegible] کۆمەڵی پێ[illegible]بەران میراتیمان لێ ناگیرێت ، چیمان لە دوا بەجێ دەمێنێ دە[illegible] بە[illegible]ێر].

(٣٠٩) **عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال:(جاءت فاطمة الى أبي بكر فقالت: من يرثك؟ فقال: أهلي وولدي، فقالت: مالي لا أرث أبي؟ فقال أبو بكر: سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: ((لانورَث)). ولكني أعولُ من كان رسول الله (ﷺ) يعوله. وأُنفِقُ على من كان رسول الله**

﴿ﷺ﴾ **يُنْفِق عليه))** (قال الالباني).أخرجه الترمذي (١٦٠٨) وقال:حسن غريب، وأحمد ١٠/١ لكنـه لم يـذكر أبـا هريرة في أسناده والطريق واحد.لكنه أثبته ٣٥٣/٢ من طريق اخرى. فالاسناد حسن

**واتـه: فاطمـه چـوو بـۆ لای ئەبوبـەکر وفـەرمووی: کـێ میراتـی تـۆ دەگرێتـه دەسـت دوای خۆت؟ فەرمووی: کەس‌و کارو منداڵەکانم. فەرمووی: ئەی بۆچی من میراتی باوکم ناگرم؟ فەرمووی: من له پێغەمبەرم ﴿ﷺ﴾ بیستووه دەیفەرموو: ئێمەی پێغەمبـەران میراتیمان لێ ناگیرێت. بەڵام من نەفەقەی ئەو کەسانە دەکێشم کە پێغەمبـەری خـوا ﴿ﷺ﴾ نەفەقـەی کێشاون و بەخێویان دەکەم.**

**وعن عائشة (رضي الله تعالى عنها): أن رسول الله ﴿ﷺ﴾ قال: ((لا نورَث ، ما تركنا فهو صـدقة)).** أخرجه البخاري ومسلم (١٧٥٨).

**واته: ئێمەی پێغەمبەران میراتیمان لێ ناگیرێت . ئەوەی له دوای خۆمـان جـێی دەهـێڵین دەکرێ به خێرو دابەش بکرێت بەسەر هەژاراندا.**

**وه هەندێکیشـی جـێ هێشـت بـۆ نەفەقـەی خێزانـەکانی** (٣١٠) **. وه هـیچ مەڕومالاتی جێ نەهێشت** (٣١١) **.**

---

(٣١٠) **عن أبي هريرة (رضي الله عنه) عن النبي ﴿ﷺ﴾ قال: ((لا يَقسِم ورثتي ديناراً ولا دِرهماً، وما تركت بعد نفقةِ نسائي ومؤنـةِ عـاملي فهـو صـدقة))** . أخرجـه البخـاري ومسـلم والترمذي وأبو داود (٢٩٧٤) وزاد فيه: ((مؤنة عاملي [يعني أكرة الارض] والخليفة من بعدي)).

**واتــه: مـیرات گرەکـانم دوای خـۆم هـیچ دینـارو درهـەمێکیان بەسـەردا دابـەش ناکرێـت، بـەڵکو ئـەوەی جـێم هێشـت دوای ئـەوەی بەشـی نەفەقـەی خێزانـەکانم‌و جێگەی کرێ گرتەکانمی لێ جیادەکرێتەوە دەکرێتە خێر بەسەر هەژاراندا.**

(٣١١) **عن عائشة (رضيالله عنها) قالت: ( ما ترك رسول الله ﴿ﷺ﴾ ديناراً ولا درهماً ولا شاةً و لابعيراً) قال: وأَشُكُّ في العبد والأمة./** أخرجه مسـلم وأبـو داود والنسـائي وأبـن ماجـه (٢٦٩٥) أنظر (صحيح أبي داود) (٢٥٤٩).

**واته: پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ هیچ دینارو درهـەم‌و مـەڕو ووشـتری لـه دوای خـۆی جێ نەهێشت. عائیشه دەفەرمووێ: گومانم هەیه له بەندەو کەنیزەکدا.**

وه ئـەبوداود ڕیوایــەتی کـردووه (٢٩٧٢) کـەوا زەوی‌یـەکی (فـدك) هــەبوو هــی پێغەمبەربوو﴿ﷺ﴾ لیٚی دەبەخشی، پاش خۆی ئەبوبەکرو عومەر سەرپەرشتیان دەکرد. پاشان مەروان داگیری کرد بۆ خۆی. کاتێ کە عومەری کوڕی عبدالعزیز بوو بە خەلیفە گەڕاندی‌یەوە بۆ بیت المال.

## خەون بینین پێوەی

هەر کەسێك پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ لە خەودا ببینێت لەسەر ئەو وەسفانە ئەوە ئەوی بینیووە چونکە شەیطان ناتوانێ بچێتە شێوەیەوە [٣١٢] .

---

(٣١٢) **عن عبدالله بن مسعود عن النبي ﴿ﷺ﴾ قال: ((من رآني في المنام فقد رآني، فإن الشيطان لا يتمثل بي)).** أخرجه الترمذي (٢٢٧٧) وقال: حديث حسن صحيح، وابن ماجه وأحمد والدارمي.

واتـە: هەرکەسـێك لەخەوذی‌دا مـن ببینێـت ئـەوا مـنی بینیـوە، چـونکە شـەیطـان خـۆی ناخاتە سەر شێوەی من [ئەمـەش موعجیزەیـەکی پێغەمبـەرە﴿ﷺ﴾ چونکە پارێزراوە لە شەیطان ].

**وعن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﴿ﷺ﴾: ((من رأنـي في المنـام فقـد رأني، فإن الشيطان لا يتصوّرُ أو قال: لا يتشّبه بي)).** أخرجه ابن ماجه (٣٩٠١) واسناده صحيح على شرط مسلم. والترمذي واسناده على شرط الشيخين وغيرهم.

واتە:هەر کەسێك لەخەونیدا منی بینی ئەوا منی بینیوە چونکە شەیطان ناچێتە سەر وێنەی من، یان شەیطان ناتوانێ خۆی بخاتە سەر شێوەی من.

وە دەفەرموێ ﴿ﷺ﴾: **((مـن رآنـي في المنـام فسـيراني في اليقظـة، ولايتمثَّـل الشـيطان بي))**متفق عليه.

واتـە: هـەر کەسـێك لەخەونیـدا مـن ببینـێ ئـەوا بـە خەبـەریش دەمبینـێ. وە شـەیطـان ناچێتە سەر شێوەی من.

[ئیمامی المناوی لەڕاڤەی ئەم فەرموودانەدا باسی ئەوەی کردووە کە خەونی ڕاست: بریتیی‌یە لەوەی کە لەسەر ئەو وێنەیە ببینێ کە لە بەڵگەی صەحیحدا هاتووە، خۆ ئەگەر لەسەر غەیری ئەو وەسفانەدا بینی وەك بالأبەرزی یان کورتی یان زۆر ئەسمەری ئەوا پێغەمبەری خوای﴿ﷺ﴾ نەدیووە. وەباسی ئەوە دەکات کەمانای وتەی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ کە دەفەرموێت:(( ...**فسيراني في اليقظة**)).بینینێکی تایبەتە بەسیفەتی نزیك بوونەوەو شەفاعەت بۆ کردن لەڕۆژی دواییدا].

وەهەندێك لە صۆفییەکان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە گوایە لەم دونیایەدا بەچاوی بەخەبەر پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ دەبینین. بەبەڵگەی فەرموودەی سێیەم، وە (ابن حجر) بەرپەرچی داونەتەوەو فەرموویەتی: (کەواتە ئەوکاتە وا پێویست دەکات کە بڵێین ئەو کەسانە صەحابەن و صەحابەیەتیش ماوە تا رۆژی دوایی!). کە ئەمەش شتێکە موسڵمان نایڵێ.

وە زەکەریا الانصاری پرسیاری کرد لە شێخی ئیسلام دەربارەی پیاوێك کەوا باسی ئەوە دەکات کەوا پێغەمبەری خوای ﴿ﷺ﴾ بینیوە لە خەوندی‌داو فەرمانی پێ کردووە بەشتێك تا بیکات، ئەویش فەرمووی: ئەمە مەکروهەو بگرە حەرامە. وە زانایان ئەوەیان ڕاگەیاندووە کەوا خەو ئەحکامی شەرعی لێوە وەرناگیرێت. وە گەورەترین بەڵگە بۆ

وە لە کۆن و نوێدا پیاو چاکان هەبوون کە لە خەودابینیویانەو وا وەسفیان کردووە کەلە شێوەیدا زۆر لەحەسەنی کوڕی عەلی (ڕەزای خوای لێ بێت) (٣١٣).

---

بەرپەرچ دانەوەی ئەو کەسانەی کە بانگەشەی ئەوە دەکەن کە گوایە پێغەمبەری خوایان ﴿ﷺ﴾ بینیوە بەخەبەری لە دوای ئەوەی وەفاتی کردووە ئەم ئایەتەیە کە دەفەرمووێ:﴿ ومن ورائهم برزخ الى يوم يبعوث ﴾ المؤمنون. واتە: لە دوایانەوە (پاش ئەوەی کە مردن) پەردەو بەرزەخێکە هەتا رۆژی زیندوو بوونەوەیان.

(٣١٣) **أبا هريرة يقول: قال رسول الله ﴿ﷺ﴾: ((من رآني في المنام فقد رآني، فان الشيطان لا يَتَمثَّلُني)) قال أبي : فحدثت به ابن عباس فقلت: قد رأيته فذكرت الحسن بن علي فقلت: شبهته به، فقال إبن عباس: إنه كان يشبهه.**/أخرجه الترمذي قال الالباني: اسناده صحيح رجاله كلهم ثقات. وأخرجه أحمد ٢٣٢/٢ من هذا الوجه والحاكم ٣٩٣/٤ وقال: صحيح الاسناد ووافقه الذهبي. وقال: الحافظ في (الفتح): وسنده جيد. وفيه تأييد لما رواه أسماعيل القاضي عن أيوب قال: كان

أبن سيرين (وهو ممن روى هذا الحديث عندالشيخين) اذا قَصَ عليه رجل انه رأى النبي ﴿ﷺ﴾ قال: صفه لي . قال: ذكرت الحسن بن علي فشبهته به، قال: قد رأيته . وسنده جيد . وعلقه البخاري.

**واته: هەركەسێك لەخەوندا منی بينی ئەوا منی بينيوەو شەيطان ناچێتە سەر شێوەی منەوە . باوكم ووتی[ ئەوەی قسەكە دەكات كولەيبە باوكی عاصم ولە تابعينەو ناوی (أبن شهاب)ەو صەدوقە]. منيش بۆ ابن عباسم باس كردو وتم: پێغەمبەرم ﴿ﷺ﴾ لە خەوندا بينيووەو يادی حەسەنی كوڕی عەليم كەوتەوەو وتم: لەو دەچێ و دەيشوبهێنم بەو. ابن عباس فەرموی: بەڵێ ئەو [واتەپێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ ] لە حەسەنی كوڕی عەلی دەچوو.**

**عن يزيد الفارسی وكان يكتب المصاحف قال: (رأيت النبي ﴿ﷺ﴾ في المنام زمن ابن عباس . فقلت لابن عباس : إني رأيت رسول الله ﴿ﷺ﴾ في النوم . فقال ابن عباس : إن رسول الله ﴿ﷺ﴾ كان يقول: ((ان الشيطان لا يستطيع أن يتشبه بي، فمن رآني في النوم فقد رآني)). هل تستطيع أن تنعت هذا الرجل الذي رأيته في النوم؟ قال: نعم ، أنعُتُ لك رجلاً بين الرجلين، جسمه ولحمه أسمر الى البياض، أكحل العينين، حسن الضحك، جميل دوائر الوجه، [قد ] ملأت لحيته**

**وەخەونی بروادار ڕاستە چونكە بەشێكە لەچل و شەش (٤٦) بەش لە پێغەمبەرايەتی** [٣١٤] .

---

**ما بين هذه الى هذه، قد ملأت نحره. قال عوف: ولا أدري ما كان مع هذا النعت، فقال ابن عباس: لو رأيته في اليقظة ما استطعت أن تنعته فوق هذا ).** أخرجه الترمذي وأبن ماجه (٣٩٠٥) قال الالباني: يعني المرفوع منه دون القصة، وهو رواية لاحمد ٢٧٩/١ واسنادالترمذي جيد رجاله ثقات رجال الشيخين غير يزيد الفارسی قال ابن قال ابن ابی حاتم ٢٩٤/٩عن أبيه: (لاباس). وأخرجه أحمد أيضاً ٣٦١/١ — ٣٦٢ ويشهد له ما قبله.

**واتە: لە يەزيدی فارسیيەوە كە يەكێك بووە لەوانەی قورئانيان نوسيوەتەوە لە (مصاحف) دا. دەفەرموێ: لە زەمانی ابن عباسدا لە خەومدا پێغەمبەرم﴿ﷺ﴾ بينی، بۆ ابن عباسم گێڕايەوەو ووتم: لەخەونمدا پێغەمبەرم ﴿ﷺ﴾ بينيووە. إبن عباس فەرمووی:**

**پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی:((شەیطان ناتوانێ بچێتە شێوەی منەوە. هەرکەس لەخەونـدا بینیمی ئەوا منی بینیوە)). ئایا ئەتوانی وەسفی ئەو پیاوەم بۆ بکەیت کە لەخەونتدا بینیوتە؟ فەرمووی: بەڵێ.بۆت وەسف دەکەم: پیاوێکی مامناوەند بوو . لاشەو گۆشتی ئەسمەرێکی سپی باو بوو. چاوەکانی ڕەش بوون. جوان پێ دەکەنی. ڕووی خڕو جوان بوو. ڕیشی پیرۆزی لێرەوە بۆ ئەوێی پڕ کردبوەوەو پڕ بە گەردنی بوو. عەوف [کە ابن أبي جميلە‌یە کە لە یەزیدی فارسی‌یەوە دەیگێڕێتەوە] دەفەرمووێ: وە لەگەڵ ئەم وەسفەشدا نازانم پێغەمبەر(ﷺ) چۆن بووە. ابن عباس فەرمووی : ئەگەر بەخەبەری‌یەوە بتبینیایە نەتئەتوانی لەمە جوانتر وەسفی بکەیت.**

(٣١٤) **قال (ﷺ): (( و رؤيا المؤمن جزء من ستة وأربعين جزءاً من النبوة )).** في جامع الصغير أخرجه أحمد والبخاري وكذا مسلم عن أنس وأبو داود (٥٠١٨) عن أنس عن عبادة والترمذي عن عبادة بن الصامت (٢٢٧٢) وقال: حديث صحيح.

**واتە: خەونی ڕاستی بڕوادار بەشێکە لە چل‌و شەش بەش لە پێغەمبەرایەتی.**

## لە کۆتایی‌دا

**زانای پایەبەرز ئیمام(ابن حزم)ی ئەندەلوسی (ڕەحمەتی خوای گەورەی لێ بێت) دەربارەی کورتەیەك لە سیفەتەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت:**

**[پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەسەر بەرزترین و گەورەترین ڕەوشت بووە. هەروەك خوای پەروەردگاری وەسفی کردووە. درودو سڵاوی خوای گەورەی لەسەربێت لە هەموو کەس بەحیلم ترو دادپەروەرترو داوێن پاك تربووە، هەرگیز دەستی بەر دەستی ئافرەتێك نەکەوتووە کە پێی نەشیابێت و مارەی نەکردبێت ، یان نامەحرەم بووبێت پێی . وە پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە هەموو کەس سەخی تر بووە" بە جۆرێ دینارو درهەمی لەلادا نەدەمایەوەو دەیبەخشی.**

خۆ ئەگەر لەلای زیاد بووایەو کەسی شك نەبردایە کە بیداتێو شەوی بەسەردا بهاتایە ئەوا نەدەگەڕایەوەماڵەوە هەتا خۆی لێ ڕزگار دەکردو دەیدا بە کەسێکی موحتاج. وە لەوەی کە خوای گەورە پێی بە خشیبوو تەنها بەشی ساڵێکی هەڵدەگرت. لە هەموو شتێك ئاسانتر دەست بکەوتایە لەو کاتەدا جۆو خورما بووە، بەڵام ئەو بە ئاسانی دەستی نەدەکەوت. چیتری لێ زیاد بووایە- لەم دووانە - لەڕێگەی خوادا دایدەنا . وەهەرچی لە خوای پەروەردگار داوا بکردایە پێی دەبەخشی. پاشان دەگەڕایەوە سەر بەکارهێنانی خواردنی ساڵەکەیو ایێی بەکاردەهێنا هەتا پێویستی دەبوو پێش تەواو بوونی ساڵەکە .

بەدەستی خۆی نەعل و پێڵاوو جل و پۆشاکی خۆی دەدوریەوەو خزمەتی کەس و کارو خێزانەکانی خۆی دەکردو یارمەتی دەدان و گۆشتی لەگەڵدا دەجنین.

لەهەموو کەس بەشەرم وحەیاتر بووە، هەرگیز چاوی ڕانەدەگرت لەسەر ڕووی کەس بەوەی بەردەوام تەماشای بکات، و وەڵامی دەعوەتی بەندەوکەسی ئازادی دەدایەوە، دیاری وەردەگرت ئەگەر چی قوومە شیرێك یان ڕانە کەروێشکێکیش بووایە، وەپاداشتی دەدایەوەو هەقی بۆ دەکردەوەو ئەودەعوەتەشی دەخوارد، بەڵام خێرو صەدەقەی وەرنەدەگرت و نەیدەخوارد.

کەنیزەك و هەژاران بانگیان دەکرد بۆ پێویستی خۆیان و ئەویش شوێنیان دەکەوت بۆ هەر شوێنێ بانگیان بکردایە.

لەبەر مافی خۆی هەرگیز توورە نەدەبوو، بەڵام لەبەرخوای گەورە توورە دەبوو. وە هەقی جێ بە جێ دەکرد ئەگەر چی بە زەرەرو زیان بشکایەتەوە بەسەرخۆی و هاوەڵەکانیشیدا.

لەبرساندا بەردی دەبەست لەسکی، هەندێ جاریش چی بووایە دەیخواردو ڕەتی شتێکی نەدەکردەوە کە هەرئەوە ئامادە بووایەو داواو تەکلیفی شتێکی نـەدەکرد کـەئامادە نەبووایـە. وەخـۆی نەدەگرتـەوە لـە خـواردنی حـەڵاڵ ، ئەگـەرخورمای بـەبێ نـان دەسـت بکەوتایـە دەیخـوارد، وەئەگـەر نـانی گـەنم بووایە دەیخوارد، ئەگەرحەڵوا یان هـەنگوین بووایـە دەیخـوارد، ئەگـەر شیری بەبێ نان بووایـە دەیخـوارد، وەئەگـەر کاڵـەك یـان خورمـای تـەڕو نـەرم بووایـە دەیخوارد.

بـە ڕاکشـانەوە یـان لـە سـەر سفرە خـواردنی نـەدەخوارد، هـەرگیز سـێ ڕۆژ لەسـەریەك تێـر نـانی گـەنم ی نـەخواردووە هـەتا گەیشـت بـە خـوای گـەورەو وەفاتی کرد، ئەویش لەبەر ئیثار و ماف خۆدان بەخەڵکی نـەك لەبـەر هـەژاریو بەخیلی .

وەڵامـی وەلیمـە(خواردنی دوای گواسـتنەوەی بـووك)ی دەدایـەوەو دەچـوو، وەسەردانی نەخۆشی دەکردو ئامادەی جەنازە دەبوو بە شداری دەکرد.

لەبـــەردەم دوژمنانیـــدا بـــەبێ پاســـەوان دەڕۆیشـــت، لـــە هـــەموو کـــەس خۆبەکەمزانتر بووەو لە هەموویان خانەی زۆرتـر بـووە بـەبێ کیـبر، وە دەسـتی ڕۆشتووە بەبێ خۆ بەگەورە گرتن وە لە هەموو کەس ڕووخۆش تربووە . هیچ شـتێکی دونیـا سـەرقاڵی نـەدەکرد، چـی بووایـە لەبـەری دەکـردو دەیپۆشـی. هەنـدێ جـار (شـەملە)، هەنـدێ جـار بـووردەی خەتـداری یەمـەنی، وەهەنـدێ جـاریش جبـەی خـوری دروسـت کـراو، چـی دەسـت بکەوتایـە لـە حـەڵاڵ دەیپۆشی.

مستیلەیەکی زیـوی لـە دەسـت دەکـرد کەسـەرو نەخشـەکەی لـە خـۆی بـوو، دەیکردە پەنجەی (بـرای تووتـە)ی دەسـتی ڕاسـت یـان چەپـی. وە کـە سـواری ووڵاغ دەبوو لە دوای خۆیەوە بەندەکەی خۆی یان کەسی تری سوار دەکـرد .

چی ولاغێك بوایە سواری دەبوو. هەندێجار ئەسپ و هەندێ جار ووشتر و هەندێ جار گوێ درێژ یان هێستر، وە هەندێ جاریش بە پێ پەتی دەڕۆیشت بە بێ کراس دامێن و مێزەرو کلاوی قەڵنسووە. بەم شێوەیە سەردانی نەخۆشی لەو پەڕی شاری مەدینەدا دەکرد. وە حەزی لە بۆنی خۆش دەکردو ڕقی لە بۆنی ناخۆش بووە .

لەگەڵ هەژاراندا دادەنیشت و نانی لەگەڵیاندا دەخوارد، وە هۆگری کەسی خاوەنی پیاوەتی دەکرد لە ڕەوشتیاندا، وەدڵی پیاو ماقول و ناودارەکانی ڕادەکێشا بە چاکە کردن لەگەڵیان. سەردانی کەس وکاری خۆی دەکرد بەبێ ئەوەی فەزڵیان بدات بەسەر کەسی لەوان چاکتردا. تەبیعەت ووشك نەبووە لەگەڵ کەسدا، عوزری عوزر هێنەری قبوڵ دەکرد. سوعبەتی دەکردو ڕاستی نەبووایە نەیدەفەرموو، پێ دەکەنی بەبێ قاقا کردن، یاری ڕەواو دروستی دەبینیو ئینکاری نەدەکرد، لەگەڵ خێزانی خۆیدا بەپێ پێش کەوتنی دەکرد، وەدەنگ بەسەریدا بەرز دەکرایەوەوئارامی دەگرت. ووشتری شیردەرو مەڕو مالاتی هەبووەو خۆی و خێزانەکانی لەشیرەکەیان دەخواردەوە، بەندەو کەنیزەکی هەبوو، لەخواردن و پۆشاکدا هەرگیز خۆی پێش نەدەخست بەسەریاندا، کاتێکی بەسەردا نەڕۆیشتووە کە تیایدا کارێکی تێدا نە کردبێ بۆ خوای گەورە"یان خزمەتێکی خۆی تێداکردووە کە پێویست بووە بیکات. دەردەچوو بۆ ناو باغ و بێستانی هاوەڵەکانی. شتی کەمیشی وەردەگرت، وە نەبیذی شیرینی (کە تا ماوی خورمایە) دەخواردەوە، ڕقی لە هەژار نەبوو لەبەر هەژارێتیو بێ دەستەلاتییەکەی، وە لە هیچ پاشایەك نەترساوە لەبەر پاشایەتیەکەی، بانگەوازی هەردووکیانی وەکو یەك دەکرد بۆ لای خوای گەورە.

ژەهرخـوارد کـراو سـیحری لێ کـرا. ئـەو کەسـەی نەکوشـت کـە ژەهـری دەرخـوارد داو ئەوکەسەشـی نەکوشـت کـە سـیحری لێ کـرد. وە بـە واجبـی نەدەبینی کە دەبێ بکوژرێت. خۆ ئەگەر لـە سەریان بە واجبی بزانییایـە کە دەبێ بکوژرێن نەیدەهێشت دەرچن و وازی لێ نەدەهێنان.

خـوای گـەورە ژیـان نامـەی بـەرزو کاربـەڕێوە بـردن و سیاسـەت و لێزانـی تەواوی پێ بەخشیبوو.

پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) نەخوێنـدەوار بـوو. نەیـدەزانی بخوێنێتـەوەو بنووسێ. وە لەناو وڵاتێکی پڕ لە نەفامێتیو خاکێکی بیاباندا پەروەردەبووە، لە وڵاتێکی هەژارو شوان کاریدا. خوای گەورە بە بەزەیی خۆی پـەروەردەی کرد. بە هەتیووی گەورە بوو بە بێ باوك ودایك، خـوای پـەروەردگار هـەموو ڕەوشت و ئاکارە جوان و ڕێگا بەرێزو سوپاسکراوەکانی فێرکرد. وە هـەواڵی پێشـینان و پاشـینانی بـەوەحی بـۆ نـارد. کـە لـەو وەحیـیـەدا ڕزگـاریو بردنـەوەی قیامـەت و بەدەسـت هێنـانی سـەر بـەرزی وشـکۆمەندی دونیـای تێدایـەو پابەندبوونەبـە واجبەکانـەوە. وەپێغەمبـەری خـوا(ﷺ) زیـادەڕۆیی لەهەموو شتێکدا وازلێ هێنا بوو.

خـوای گـەورە تـەوفیقمان بـدات بـۆ گـوێ ڕایـەڵی کردنـی ئـەو پێغەمبـەرە بەڕێزە(ﷺ) لەفەرمانەکانیداو شوێن پـێ هـەڵگرتنی لەکردارەکانیدا. جگـە لەوانەی کە تایبەتە بە خۆیەوە . آمین آمین. ]انظر جوامع السیرة النبویة ص (٣٥-٣٨)

**قال عبدالله بن المبارك: (إذا أبتُليتَ بالقضاء فعليك بالأثر).** أخرجه الترمذي. قال الالباني: اسناده الى ابن المبارك صحيح وهو من كبار شيوخ الامام أحمد الذين يكثر من رواية عنهم في (المسند) وغيره، توفي سنة ١٨١.

**واته: عبداللەیکوڕی موبارەك فەرمویەتی: ئەگەر تاقی کرایتەوە بەدادوەریکردن [لە نێوان خەڵکیدا ] دەست بگرە بە ئەثەرەوە. [واتە دەست بگرە بە فەرموودەی گێڕدراوە لە پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾و خەلیفە ڕاشیدینەکانەوە لە ئەحکامو قەزاوەتیاندا] .**

**ئیمامی النووی لە (شرح مسلم)دا دەفەرمووێ: (الأثر): بەلای فەرمووودەناسانەوە هەموو فەرمودەیەکی مەرفوعو مەوقوف دەگرێتەوە (وەکو خەبەرو حەدیث).**

**عن ابن سيرين قال: (هذا الحديث دينٌ، فانظروا عمن تأخذون دينكم).** أخرجه مسلم وغيره ،قال الالباني: هو في (مقدمة صحيح مسلم) بلفظ: (**أن هذا العلم دين ...**) وقد رواه بعض الضعفاء مرفوعاً إلي النبي ﴿ﷺ﴾ ولا يصح، وقد خرجته في (الضعيفة) (٢٤٨١).

**واتە:ابن سیرین(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) [سیرین ناوی دایکێتی کە خزمەتکارێکی ئوم سەلەمەی دایکی ئیمانداران بووە (ڕەزای خوای لێ بێت). وە ئەم ئەثەرەش لێرەدا باس دەکرێت بۆ زیاتر وریابوون و دڵنیابوون و چەسپان لە کاتی گێڕانەوەی فەرموودەدا ] فەرمویەتی: ئەم زانست وفەرموودەیە[ کەبە ثابتیو چەسپاوی لە پێغەمبەرەوە ﴿ﷺ﴾ هاتووە] دینەو دەکرێتە دین، جا سەرنج بدەن بزانن دینەکەتان لە چ کەسێکەوە وەردەگرن.[واتە سەرنج بدەن بزانن لە کێوە دینەکەتان ڕیوایەت دەکەن. کەواتە لە هیچ کەسێکەوە ڕیوایەتی مەکەن تا ئەهلیەتی ئەزانن بەوەی کە لەو کەسانە بێت کە عادل و جێی متمانەو لە خوا ترس بێت**

## سەرچاوەکان

(١) مختصر الشمائل المحمدية . الامام أبي عيسى محمد بن سؤرة الترمذي صاحب السنن ٢٠٩ – ٢٧٩هـ إختصره وحققه : محمد ناصرالدين الالباني . المكتبة الاسلامية عمان/ الأردن الطبعة الاولى ١٤٠٥ هـ .

(٢) قطوف من الشمائل المحمدية ﴿ﷺ﴾ والاخلاق النبوية والآداب الإسلامية . جمع و ترتيب: محمد بن جميل زينو . المدرس في دار الحديث الخيرية بمكة المكرمة .

(٣) النبي ﴿ﷺ﴾ في بيته . بقلم: الدكتور محمد بن موسى آل نصر . الطبعة الاولى ١٤٢١هـ – ٢٠٠٠ م . مركز الامام الالباني للدراسات المنهجية والأبحاث العلمية . عمان / الاردن .

(٤) مختصر سيرة الرسول﴿ﷺ﴾. محمد بن عبدالوهاب

# پێڕست